# گەشتی
# دڵی خواناسێك

نوسەر
د. فلاح محمدعزیز

بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

بـــەرگ
تــرایــزۆن

قەبارەی کتێب
١٤×٢٠ - (٨٠)لاپەڕە

نۆرە و ساڵی چاپ
یەکەم ١٤٢٧ ك - ٢٠٠٦ز

تـــیراژ
٣٠٠٠دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی (٥١٤) ی ساڵی ٢٠٠٦ی پێدراوە



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

پێشکەش بە

نموونەی مرۆڤایەتی.....

پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ

گیانی پاکی باوکم ....

کە منی بە خواناسان ناساند

# نـــاوەڕۆك

# پێشەکی

ئەم نامیلکەیە باسی ئاوات و هەوڵ و کۆششی چەندین خواناسە کە سەرگوزشتەی گەشتی دڵیان بەرەو بارەگای خۆشەویستیی خوای میهرەبانە و لەسەر زاری یەك کەس گوتراون؛ بەو هومێدە کە ببێتە بەرنامەیەك بۆ نەوەکانمان و مایەی بەهرەمەندی دڵ و دەروونیان بێت.

کاری سەرەکی ئەم نامیلکەیە کۆکردنەوەی گوتە بەرزەکانی خواناسانە لە پێغەمبەران و پیاوچاکان. ئەو خواناسانە ئەو جۆرە وشانەیان تەنیا بۆ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار وتووە، پێشیان ناخۆش نەدەبوو گەر وتەکانیان بڵاوبکرێنەوە بێ ئاماژەدان بە ناوەکانیان . یەکێك لەم زانا پایە بەرزانە دەفەرموویت:

((کاتێك کەسانێك بیرو ڕامان وەردەگرن و بەناوی خۆیانەوە بڵاویدەکەنەوە، تووڕە دەبین و بەگژیان دەچین وپێمان خۆشە تەنیا ناوی خۆمانی بەسەرەوە بێ؛ ئێمە ئەوە دەکەین چونکە باوەڕمان بەو بیرو رایە زۆر بتەو نییە، لەناخی دەروونیشمانەوە هەڵنەقوڵاوە، وەکوو وایە لەدەرەوەی ویستمان دەرچووە، ئەویش کاتێك کەسایەتیمان لە خودی بیروڕا و باوڕمان خۆشەویستتر بێت!! خۆشیی

راستەقینە بەرهەمی سروشتیی بینینی بیرو رامانە لەدەست خەڵکانی تر و کاتێ ببێتە خۆراك بۆ دڵ و دەروونیان. تەنیا بازرگانەکان سوورن لەسەر ئەوەی پەیوەندیە بازرگانیەکەی بابەتەکانیان نەکەوێتە دەست بازرگانەکانی تر، چونکە بەوە قازانجیان کەم دەبێتەوە، بەڵام خاوەن بیروڕاکانن قازانجیان لەوەدایە کە خەڵکی هاوبەشی ئەو بیروڕایەیان بن و باوەڕیان پێی هەبێ، هەتا ئەو رادەیەی کە ناوی خۆیانی لێ بنێن!)).

لەم نامیلکەیەدا ئێمەش ئیشارەمان بە هیچ سەرچاوەیەك نەداوە لەبەر ئەوەی ویستوومانە لە رەوتی نووسینی ئاکادمی دوورکەوینەوە، چونکە ئەو جۆرە نووسینانە لەگەڵ بابەتەکەمان ناگونجێ‌و ناوەرۆکی وشك دەکات .

هەرچی لەم نامیلکەیە هاتووە وتەی راستییە و سەرچاوەکەی قورئانی پیرۆزە، یان فەرموودەی پێغەمبەرە (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت)، یان وتەی زانای پایەبەرزە کە لەلایەن تێکڕای زانایانی موسڵمان متمانە بە قسەکانیان دەکرێت.

کە دەڵێین بەهەشت و دۆزەخمان بینیوە، سەرچاوەی بینینمان وشە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرە (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت)، تەنانەت زۆر لە یارانی پێغەمبەر (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت) لە شوێنی خۆیان لە دونیادا وەسفی بەهەشت یان دۆزەخیان کردووە.

ئەم گەشتە چیرۆکێکە بۆ هەر کەسێك بیەوێ بۆ بەرزترین ئاوات بڕێ و باڵاترین ئەنجام بەدی بهێنێ.

دوا گوتەشمان ستایشی خوای خاوەن گشت جیهانەکانە.

# مرۆڤێکی سادەو ئاواتێکی بچووک

بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ باوەشم بەدونیادا کردبوو، ئاواتگەلێکی بچووکم بۆ خۆم دەهۆنییەوە، یاخود خۆیان دەهاتنە بەردەمم و خۆیان دەنواند، منیش بەدوای بەدیهێنانیاندا دەچووم، هەندێکیان دەهاتنەدی و ئاواتی تر دەهاتنە جێیان، ئەوانی تریش تەنیا ئاواتی بەتاڵ و دوور لە هاتنەدی بوون و کاتم پێ دەبردنە سەر.

ئاواتەکان بەگشتی سادەبوون و هەزاران هەزار کەسی تری وەک منیش بەدوای ئەو جۆرە ئاواتانەدا وێڵ بوون. هەستم دەکرد منیش و ئەوانیش لە بازنەیەکی بەتاڵدا دەسووڕاینەوە. دوای تێڕوانینی ئەلبوومی ژیانی هەزاران کەس بۆت دەردەکەوێ کە دەبێ پاش پەنجا ساڵی تر وێنەی خۆشت چۆن دەبێ، لەوانەیە خۆت نەناسیتەوە!! جا ئەگەر پاشا بی یان کرێکار، پایەداربی یان بوودەڵ، ئەنجام هەر یەکە. لەسەرەتای تەمەندا دونیا بەوپەڕی جوانی پێشوازیت لێدەکا، کەچی بەناشیرینترین شێوە پشتت تێدەکات. بەپێکەنین پێشوازیت لێ دەکەن و بەگریان ماڵئاواییت لێدەکرێ. شەو و ڕۆژ زۆر بەخێرایی دەڕۆن. ناخۆشییەك یان کارەساتێك لە لوتکەی خۆشییەوە فڕێت دەداتە بناری ئەشکەنجەکان. گەر دەسەڵاتدار بی هەمیشە خەمی بەردەوامی کورسییەکەت دەخۆی؛ گیان کێشان لای

هەندێ کەس لە کورسی ستاندن ئاسانترە. هەژار هەمیشە چاوی لە دەوڵەمەندیی دەوڵەمەندانە؛ دڵ و دەروونی دڵداران بە ئاگری دووری خۆشەویستەکانیان کڵپە دەکا و ئەناڵێنێ، کە دەستی دەکەوێت دوای ماوەیەك دڵی ئارام دەبێت وبەدوای ئاواتی تردا دەکەوێتە رێ، خاوەنی کۆشك و تەلاران سەرقاڵە و لە هەوڵێکی بێ وچانە بۆ دەسکەوتنی کۆشك و تەلاری تر. کەس بە حاڵی خۆی رازی نییەو هەموو بەدوای بەدیهێنانی ئەم ئاواتە بچووکە نەبڕاوانەن.

پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی ئادەمیزاد وا دەگەیێنێ کە نەخشی لە ژیاندا زۆر لەو ئاواتانە بەرزترە. خوێندنەوەی واتای فەیلەسووفەکان و کتێبی خاوەن بیر و فیکرو زانستەکان نەیتوانی ئاواتەکانم لەچوارچێوەی تەسکی ئەم دونیایە، یان ئەم بازنە بەتاڵەدا بباتەدەر!! مێشکم قەناعەت بەو رێبازە ناکات کە فەیلەسووفە ماددییەکان گرتوویانەتە بەر و دڵم بەو ئاواتە بچووکانەی کە لە ناو ئەم بازنە بەتاڵەدا دەمسووڕێنن، ئۆخەی نایەتێ و ئۆقرەیی و متمانەیی پێ نابەخشێ. بۆچوونی هەندێ لەو زانستانەی سەردەم لەبڕی دەرخستنی گرنگیی رۆڵی ئادەمیزادو باڵابوونی لەناو سەرجەم بوونەوەرەکاندا کێشەکە دەشێوێنن و ئاڵۆزتری دەکەن. ئەوانە ئادەمیزادیان کردە ئامۆزاو برازای مەیموون وشامپانزی و بڕیاریان دا ئاواتەکانی ئادەمیزاد نابێ لە چوارچێوەی ئاواتەکانی ئاژەڵ دەربچن، بەڵام لقە نوێیەکانی هەمان قوتابخانە زانستییەکە ناچار بوون دوای

لێکۆڵینەوەی فراوانتر، دان بە باڵابوونی مرۆڤدا لەناو بوونەوەرەکاندا بنێن و ئاستی شیاوی خۆی بۆ دابنێین. دەستی ناپاکی دژ بە مرۆڤایەتی هەموو ڕێگایەک دەگرێتە بەر بۆ تێکدانی ڕەوشتی خەڵک، تەنانەت بە بەکارهێنانی بیردۆزی زانستیی نەسەلمێنراو.

کورتیی ماوەی ژیان بە بەراوردکردن لەگەڵ تەمەنی دوورو درێژی ئەم گەردوونەو گرنگیی پێکهاتەی جەستەیی و دەروونیی ئادەمیزاد تێیان گەیاندم، کە دەبێ ڕۆڵی ئادەمیزاد لە ڕۆڵی بوونەوەرانی دەوروپشتی گرنگتر بێت و دەبێ تەمەنیشی لە تەمەنی ئەوان درێژتر بێت، ئەوەش ڕاستەوخۆ منی گەیاندە ئەو قەناعەتە کە مردن کۆتایی ژیان نییە، بەڵکو ژیانێکی تری بەدواوەیە.

چیرۆکی زۆر هەن پێویستیان بە تەواوکردن هەیە، ستەمکاران لەناو پێخەوی ئاوریشم دەمرن، خاوەن ماف و ستەملێکراو بە زگی برسی و لە بن بەردا گیان لەدەست دەدەن!! ئەم چیرۆکانە دەبێ کۆتاییەکیان هەبێ؛ ماف خوراوەکان دەبێ مافی خۆیان وەربگرن و دوژمنانی مرۆڤایەتی دەبێ بە سزای خۆیان بگەن. ئەندازەی وردی پێکهاتەی گەردوون ئەم ڕاستیيانە دووپات دەکاتەوە. زانایەکی پایەبەرزم دەناسی نانی نەبوو بیخوات، کە قوتابیەکانیشی پارچە سەموونیان بۆ دەهێنا وردەسەموونەکەی بۆ مێرووەکان هەڵدەڕشت و دەیگوت: ئاگاتان لەو زیندەوەرانە بێ، ئەمانە گەل و میللەتن وەک ئێمە! دواتر ئەو زانایە دوای دەیان ساڵ لە ڕاونان و ئەشکەنجەدان لە

لایەن دوژمنانی مرۆڤایەتییەوە لەسەر جێگەی نەخۆشی مرد. دەبێ چارەنووسی ئەو زانایە وابێ و چارەنووسی جەلادەکانشی سەرینی ئاوریشمی بێ؟! رۆشنبیرێکی ترم دەناسی مامۆستای زانکۆ بوو، جل و بەرگە نوێکەی خۆی لەیەکەم رۆژی وانە وتنەوەدا پێشکەش بە قوتابییەکی هەژار کرد، کە بەجلێکی کۆن هاتبوو، هەر لەژووری مامۆستا جل گۆڕینیان کردو مامۆستا جلی کۆنی قوتابییەکەی دەبەر کرد. ئەو رۆشنبیرە مەزنە لەسیدارە ئەدرێ لەبەر چەند وشەیەکی چاکسازی ناو کۆمەڵ و جیهاندا، هەرچەندە ناوی کەسی نەبردبوو، بکوژەکەشی نازناوی قارەمانێتی جیهانیی وەردەگرێ. نەخێر! ئەمە لەگەڵ دادپەروەریی بێ سنووری خوای گەورە ناگونجێ و بوونی رۆژی پاداشتدانەوەو سزادانیش دووپات دەکاتەوە.

قەبارەی گۆڕانکاریی خێرای ژیانی دانیشتوانی سەر زەوی لەوپەڕی خۆشی و لەزەت و لاویەتییەوە بەرەو جیهانی بێزاری و دڵتەنگی و پیری و مەترسی کۆتایی هاتن پاڵیان پێوەنام نیشتمانێکی تر بۆ نیشتەجێبوونی دڵی خۆم بدۆزمەوەو ئاواتەکانم لە سنوورە تەسکەکانی دونیا بەرمە دەرێ و بەرەو ئاسۆیەکی فراوانتر بیانگوێزمەوە. بەڵام، تۆ بڵێی ئاواتی بەرزتر هەبێت لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەم دونیا تەسك و سنووردارە؟

# لە ناو بەهەشتدا

لەناو خەمی بێزاری و بێوەفایی دونیای کورت و قەناعەت نەکردن بەو ئاوات و ئەنجامە کورتانەی ژیانی سەر دونیا و دوای تێڕوانینێك لە ئاسمانی پان وبەرین و چاوەڕێکردنی میهرەبانیی خوای پەروەردگارو بە چاوپێخشاندنێکی ورد لە لاپەڕە جوانەکانی کتێبی خوا، ڕووناکیی دەرگای بەهەشتی پان وبەرینی خوای گەورەم لێ دەرکەوت. وشە پیرۆزەکانی خوام وشە بە وشە خوێندەوە، هەستم کرد وشەی ئاسایی نین، ئاسایی نەبوون بەڵام ڕاستەقینە بوون، ئەگەری ڕاست و هەڵەیان تێدا نەبوو، بیردۆزو خەیاڵیان تێدا نەبوو، تەنیا وەسفی جیهانی دوای مردن ناکەن، بەڵکو دەتبەنە ناو جیهانی ڕاستەقینە. گەر بە دڵ و دەروونێکی زیندوو و بە هەست و هۆشێکی تەواوەوە بیانخوێنیتەوە، هەست دەکەی لە دونیا نەماوی و وا لەناو ئەو جیهانەدا دەژی. بەهەشتم بە چاوی خۆم بینی، بۆن و بەرامەکەی گیانی خرۆشاندم و دەروونی هەژاندم، هەرچەند دڵنیابووم کە ئەو دەروازەیە لەڕوومدا کراوە نییە، چونکە چاوەڕێی پێشکەشکردنی نرخی کردنەوە و چوونە ژوورەوەی دەکرد. قۆڵم لێ‌هەڵکردو غیرەت و ئارەزوو و هەوڵ و هیممەتم وەبەرخۆنا و کەوتمە ڕێ، بەرەو بەهەشتی بەرین. ئاواتە ناکام و کورت

ئەنجامەکانی دونیا، ناچاریان کردم سوور بم لەسەر هەنگاونان بەرەو ئەم ئاسۆ رووناکە.

سەرەتا وامدەزانی گەر روو لە بەهەشت بکەم، ئەوا روو لە جیهانی خەیاڵ و دوور لە زەوی و دانیشتوانی دەکەم، لە زانست وپێشکەوتن و گەشەپێدانی ژیان دووردەبمەوە...

بەڵام بەپێچەوانەوە...!

ئاواتی گەیشتن بە پلە بەرزەکانی بەهەشت، توندترین پاڵنەر بوو بۆ خزمەت گەیاندن بەخەڵك و چاکسازی دڵ و دەروون و کۆمەڵگا و تەنانەت جیهانیش، چونکە رێگای چوونە بەهەشت بەجێهێنانی ئەم ئەرکانە بوو!! نرخی چوونە بەهەشت بریتییە لە تێرکردنی برسی و سەرخستنی ستەم لێکراو و وتەی راست بەرامبەر ستەمکاران و خاوێنکردنی رێگاو وبان و چاندنی درەخت و راگرتنی دڵی برادەر و دراوسێ و لە کاری خزمەتگوزاری بۆ خەڵك و ... لەلایەکی ترەوە، ئازاری خەڵك و تەنانەت بە ئازاردانی پشیلەیەك بە ناحەق، دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لەو بەهەشتە!

زۆر سەیرە! جاران هەزاران ئاواتم هەبوو، هەندێکیان زیانیان لە قازانجیان زیاتر بوو، هەندێکشیان بەسوود بوون؛ هەرچەندە زۆر کەمشیان خوێندنەوەی بەرامبەری تێدا بوو، کەچی ئێستا تەنیا بە یەك ئاوات دەژیم و ئەویش گەیشتن بەبەهەشتی پان وبەرینی خوایە، بەڵام لە رۆژێکدا سەدان ئیش دەکەم و زۆربەیان لەدەرەوەی

چوارچێوەی زاتی خۆمەو هەموویشیان بەسوودن. کاری چاکسازیی خۆم وەدەورِوپشتم پێی دڵمی گواستەوە بۆ دیوی ناوەوەی بەهەشت، بۆنە خۆش و دیمەنە جوانەکانی هەموو دونیای لە هەست و هۆشمدا سرِییەوە و دەروونمی وا دەوڵەمەند کرد کە لەساتێکدا ئامادەبووم گەر هەموو دونیا هی خۆم بێ بیکەمە پاروویەك و بیخەمە دەمی هەژارێکەوە. هەڵبژاردنی بەهەشت وەك تەنیا ئاوات، دەروونمی لە بەندایەتی بۆ غەیری خوا رزگارکرد. ئەو بەهەشتە تەنیا چارەسەرێکە بۆ ئەو ململانێ درِندانەیەی کە مرۆڤەکانی ئەمرۆ خۆیان پێوە سەرقاڵ کردووە بۆ گیرفان پرِکردن و ورگ زلکردن. لەناخی دەروونیاندا تەنیا ئەو دونیا بەرتەسکە هەیە، کە شەرِی لەسەر بکەن، لەبەر ئەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان ئامادەن هەموو بنەماکانی مرۆڤایەتی پێشێل بکەن. بەڵام ئەوەتا خوای مرۆڤایەتی دەرگای جیهانێکی فراوانتریان بۆ دەکاتەوە. هەر خوا خۆی باش دەزانێت کێشەکانی ئەم سەردەمە بەچی وچۆن چارەسەر دەکرێن.

لەناو بەهەشتدا، دیمەنی زۆر جوان دەبینی، ئەمانە هەندێ لەو دیمەنانەیە:

کۆمەڵێك فریشتە لەناوەرِاستی بەهەشتدا دەبینی، خەریکی دروستکردنی تەلارێکی ئێجگار گەورە دەبن، لەشوێنێکی ئێجگار خۆشدا. هێشتا لەوێیت کاتێك تەواوی دەکەن. خۆ وەك تەلارێکی

دونیا نییە بە ساڵێك یان زیاتر تەواو نەبێت، تەلارەکە تەواو سەرنج ڕاکێشە، دەڵێی بووکی دەریایە ، یان خۆری بەرەبەیانە! لەخۆت دەپرسی: دەبێ خاوەنی ئەم تەلارە کێ بێ؟ دوای پرسیار لە یەکێ لە فریشتەکان، گوتی: خوای گەورە بانگی کردین و فەرمووی: بەندەیەکم هەیە دەزانم پاش ماوەیەك کوڕپەکەی دەمرێ، قسەکانیم بۆ تۆماربکەن، زۆر جار دەڵێت ڕەزامەندی خوام لە هەموو شتێك لا گرنگترە، با بزانین وەڵامی چی دەبێت. فریشتەکە گوتی: کە کوڕپەکە گیانی لەدەست دا ئێمە لەوێ بووین، دوایی گەڕاینەوە بۆ لای خوای گەورە، فەرمووی: تەمەنی کوڕپەی بەندەکەم کۆتایی پێهات؟ ووتمان: بەڵێ خوایە، فەرمووی: جەرگی بەندەم بە مردنی کوڕپەکەی سووتا؟ وتمان: بەڵی خوایە، فەرمووی: ئەی وەڵامەکەی چیبوو؟ وتمان: تەنیا سوپاس تۆی دەکرد و ددانی بەوە نا کە خۆی و کوڕپەکەی موڵکی تۆن، ئەوەی لەلای خواوە بێت بێ گومان قازانجی ئەوانی تێدایە. ئینجا خوای میهرەبان فەرمووی: فریشتەکانم! دەبڕۆن وتەلارێکی گەورە لەناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ ئەو بەندەیەم دروست بکەن وناوی بنێن تەلاری (سوپاس).

بەلای کۆمەڵێك فریشتەدا تێپەردەبی، زەرفێکیان پێیە خۆڵەمێشی لەناودایە، هەڵیاندەڕشتە ناو ڕووبارێکی بەهەشت. پێیان دەڵێیت: ئەمە چییە؟ دەڵێن: ئەمە پاشماوەی لاشەی هەندێ کەسی ناو دۆزەخە. خوا فەرمانی دا بۆ بەهەشت بگوێزرێنەوە لەبەرئەوەی

کەمێك چاکەیان هەبووە بەرامبەر کارە خراپە زۆرەکانیان، کە لە دونیادا دەیانکرد، ئەوەتا لەناو روباری ژیان لە بەهەشتدا دیسانەوە دەڕوێن. کە سەیرم کردن سیمای سەرسوڕمانێکی بێ وێنەیان پێوە بوو، بەیەکتریان دەگوت : دەبێ ئەمە خەو بێ، یەکێکیان دەیگوت : چما لە دۆزەخ خەو هەبوو تا خەون ببینین، ئەوە هەر بەزیی خوایە، ئێمەی لە دۆزەخ رزگارکردو هێناینیە ئەم شوێنە خۆشە. دەبێ ئەمە بەهەشت بێ؟ بێ گومان ئەمە بەهەشتە.

یەکێك لە ئاهەنگە هەرە گرنگەکانی دانیشتوانی بەهەشت کاتێ کە مردن لەناوبرا! مردن بەشێوەی ئاژەڵێکی گەورە هێنرایە سەر دیوارێکی بەرز بۆ ئەوەی هەردوو دانیشتوانی بەهەشت و دۆزەخ پێکەوە ببینن ، بەسەربڕینی ئاژەڵەکە کۆتایی بە مردن راگەینرا، ئینجا وەرە سەیری ئاهەنگی بەهەشتیەکان بە کوتایی هاتن بە دوامەترسیەکەیان و خەفەت وحەسرەتی دۆزەخێکان کە مردن دوا ئاواتیان بوو بۆ رزگاربوونیان لە دۆزەخ.

لەئاسۆی دوورەوە جێی زۆر خۆشتر دیار بوون، وام دەزانی ئەوە کۆتایی بەهەشتە، بەڵام دەرچوو ئەوە پلەیەکی بەرزترە لە بەهەشتدا، دوا پلەی بەهەشتیش فیردەوسە، کە بنمیچەکەی عەرشی خوایە. وا دیارە لەچاو ئێرە خۆشترە. ئاواتی گەیشتن بە فیردەوس باڵی پێوەنام کاری بۆ بکەم.لەوانەیە هەریەك جار هەلێکی وام بۆ بڕەخسێ، ئینجا بۆ نەگەمە ئەو پلە بەرزە! پلەی بەرز کاری گرنگی

دەوێ، بێجگەلە پاداشتی بەهەشت، بەها مرۆڤایەتییەکانیشم بەرزتر دەکات، بەرزبوونەوەی ئاستی مرۆڤایەتی تەریبە لەگەڵ بەرزبوونەوە بە پلەکانی بەهەشتدا.

کە دەچیتە ناو فیردەوس هەر دەڵێی تازە پێ دەنێیتە ناو بەهەشتەوە، دیمەنێکە هەموو هەستەکان لە بەرامبەریدا جۆش دەخۆن. بە خۆم وت: ئینجا دوا ئاواتم بینی، ئیتر هیچی ترم ناوێ، چیم لەوە زیاتر دەوێت، بەتایبەتی، کە زانیم لەم پلەیە پێغەمبەری خواش (دروودو سەلامی خوای لەسەر بێ) نیشتەجێدەبێ؛ ئیتر دڵم بەم جێیە بەسترایەوەو داواکاریی تری نەبوو.

بەناو ئەم پلەیەی بەهەشتدا پیاسەیەکی خۆشم کرد، چاوم بڕییە روبارەکانی، ئاوریشمی سەرینەکانی و بەرگی سەر نوێنەکانی، دەنگی ئەو مۆسیقا نەرمەی لە ئەنجامی لەیەکدانی گەڵا دارەکان تێکەڵ بە قوڵتەقوڵتی جامی شەراب و گۆرانی سەر لێوی ئاڵی حۆرییەکان مێشکی خولاندمەوە. هەندێ شتیان لە نازونیعمەتەکانی دونیا دەچوون، ئەوە روبارێکی سازگارە، ئەمانە ئافرەتی جوانن، ئەم خواردنانە میوە و گۆشتن، ئەو خواردنەوەیە شەرابە، بەڵام تام و چێژیان هەرگیز نەمچێشتبوو، تەنانەت بەرهەمەکانی لە بەرهەمی پلەکانی تری بەهەشت ئێجگار بەتامتر بوون. نە بستێك خۆڵ و نە تەپ و تۆزێك دەبینی، ئای کە رقم لە تەپ و تۆزە!! ئارەزووەکانت هەمووی جێبەجێ کراون.

یەکێك دەبینی داوای دەکرد منداڵی پێ ببەخشرێت؛ دیارە لە دونیادا خوا منداڵی پێ نەبەخشیبوو، لەساتێکی زۆر کەمدا منداڵێکی پێ بەخشرا. یەکێکی تر حەزی لە رواندنی درەخت دەکرد؛ ئەوی تر داوای دەکرد برادەرێکی خۆی ببینێ کە لەدونیادا داوای لێدەکرد رێی خوا بەردات؛ کە پێی دەگوت : چیت داوە لە رێی کۆنەپەرستی و دواکەوتن؟ بۆ سەیری بەردەمی خۆت ناکەیت؟ داهاتوو نەك رابردوو. ئەویش لە وەڵامدا پێی دەگوت: جیاوازی من و تۆ ئەوەیە کە من کەمێك دوورتر دەڕوانم، من چاوم لە بەهەشتە، واتە چاوم لە داهاتووە. داهاتووی تۆ، کە دونیایە لەداهاتوویەکی زۆر نزیکدا دەبێتە رابووردوو، بەڵام داهاتووی من کە بەهەشتە، بەردەوامیی هەمیشەیی بۆ نووسراوە. ئەو رێبازەی من گرتوومەتە بەر، دانەرەکەی دانەری رێبازی سووڕاندنی مانگ و رۆژ و ئاسمانەکانە، رێ و رێبازیان لە رێی خواناسی من کۆنتریشە، نەخێر! رێی خوا کۆن و تازەی بۆ نییە، چونکە خوا کاتەکانی رابوڕدوو و داهاتوو بەیەك چاو سەیر دەکات، بەڵام برادەرەکەم بەقسەی نەدەکردم، هەرچەندە قەناعەتی بە بەڵگەکانم دەکرد ؛ با بزانم ئەمڕۆ چارەنووسی چییە. برادەرە بەهەشتییەکەم داوا لە برادەرەکانی دەکرد لەگەڵیدا سەیری چارەنووسی ئەو زەلامە یاخیبووە بکەن، بەڵام کەس ئامادەنەبوو سەیری دۆزەخ بکات، بەڕاستی دۆزەخ ترسناکە، لەبەر دووکەڵی رەشی کەس کەس نابینێت، (تەنانەت جارێك خوای

گەورە فریشتەکانی ناردبوو بۆ دۆزەخ و رایسپاردن پیاوێك دەرکەن لە دۆزەخ و بۆ بەهەشت بیگوێزنەوە. فریشتەکان نەیانتوانی پیاوەکە بدۆزنەوە هەتا خوا خۆی دەستنیشانی شوێنەکەی بۆ نەکردن؛ کە لە نێوان کۆمەڵە بەردێکدا لەناو دۆڵێکی دۆزەخدا برژابوو. هۆی دەرکردنیشی لە دۆزەخ هەر ئەوە بوو جارێك لە دونیادا لە دەرگای بارەگای خوای دابوو ولەبەر چاوچنۆکی رێگای دوور لە خوای هەڵبژاردبوو. بەڵام ئیشی خراپەکاری ئاشکرانەدەکردو شانازی پێوە نەدەکردو ددانی بەوە دەنا کە دەبێ فەرمانی خوا لەسەرووی هەموو فەرمانێك بێ) . برادەری بەهەشتیم برادەرەکەی لە ناوەڕاست دۆزەخدا بینیو بانگی کرد : سوپاس بۆ خوای مەزن کە یارمەتی دام دوای قسەکانت نەکەوم، ئەوەی من و تۆی تێدایـن، مـن لـە بەهەشت و تۆش لە دۆزەخ، ئەوە داهاتووی راستەقینەیە.

جۆرەها داواکاری دەبیستیت، هەمووشیان دەم و دەست دەهاتنە دی، بەهەشت جێگای هاتنەدیی داواکارییەکانە.لەناو بەهەشتدا زۆر مامەوە، هەست وهۆشم مەست ببوون . تا دڵم خورپەی لەزەتێکی نوێی بۆ لەناو بەهەشتدا دروست نەببوو، هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات ئاواتێکی تر لە ئاواتی چوونە ناو بەهەشت بەرزتر هەبێت..!

# ئاواتێکی بەرزتر!!

لە گەرمەی سەرقاڵبوونم بە لەزەتەکانی ناو بەهەشت، دەنگێکی ئاسمانی لەگوێی دڵمدا زرنگایەوەو دەیفەرموو:

((ئەی دڵی بەندەم هەتا کەی لەگەڵ دروستکراواندا پەیوەست دەبی؟ بۆچی هەمیشە لە جیهانی ئەوینی راستەقینەییەوە دووری؟ تاکەی رووناکەیە دەستی خۆشەویستیی خوایی کە بەشەو و رۆژ بۆت درێژکراوە؟ کەی ئاستی ئاواتت بەرز دەکەیەوە لە درووستکراوەوە بۆ درووستکەر، لە بەندەوە بۆ پەروەردگار؟ کەی تێدەگەی کە من سەرچاوەی هەموو بوونەوەرێکم، سەرچاوەی هەموو خۆشییەکم، سەرچاوەی هەموو خۆشەویستییەکم، تەنانەت سەرچاوەی هەموو جوانییەکیشم؟ تاکەی پشت دەکەیە سەرچاوە و روو لە لقەکان دەکەی؟ ئەم بەهەشتەی کە هۆش و دڵتی لە خۆشی پڕ کردۆتەوە، ئەم بەهەشتە- ئەی بەندەم -هاوبەشی زۆرە، دروستکراوە، روو لە من کە، بۆ رەزامەندی من هەناسەبڕ بە، هۆشت لەگەڵ من بێ، خواردنت یادکردنی من بێ، خواردنەوەت رووکردن لە میهرەبانی من بێ. گۆڕەپانی خۆشەویستان و یارانی من قەرەباڵغ نییە، مرۆڤی ورەندی دەوێ، چونکە خۆشی و لەزەتەکەی نایەتە گوتن، ئاستی ئاواتت بەرزکەرەوە و وەرە ئەم پانتاییە. دەبێ بزانی کە روو لە گەورەی گەورەکان و شاهی شاهەکان دەکەیت، کە بەخششی بێ سنوور وبێ وێنەیە. زۆر کەس وا دەزانن گەر روو لە من بکەن

دونیایان لە کیس دەچێ و زەرەرمەند دەبن، یان ئارامی و پشوودانەوەیان لێ‌دەبڕێت. هەندێکی تر کە چاویان بە بەهەشت دەکەوێ، وادەزانن ئەوە کۆتایی ئاوات و خۆشییەکانە. ئەدی نازانن من خاوەنی دونیا و ئاخیرەتم، دروستکەری بەهەشت و دۆزەخم، سەرچاوەی ئارامی و ماندویەتیم، هەڵسووڕێنەری ئەستێرەو هەسارەکانم؟ هەندێ کەس کاتێ توشی کزی دێن و بێ توانا دەبن، روو لە من دەکەن، کاتێکیش توانا و دەسەڵاتییان پێ ببەخشم، پشت لە من دەکەن ودەڕۆن. دووپاتی قسەی هەندێ لە گومرایان دەکەن کە دەڵێن : خەڵکی لە ڕابوردوو لاوازبوون، بۆیە روویان لە خوا دەکرد، بەڵام لەم سەردەمەدا کە ئاستی زانستی وتەکنۆلۆژی بەرزبۆتەوە ئادەمیزاد پێویستی بە خوا نییە، چونکە دەتوانێ هەموو شتێکی دەست کەوێت. دیارە لاوازیی، راستییەکان دەردەخات و توانا، دایاندەپۆشێ. بەڵام باوەڕدارانی راستەقینە بەپێچەوانەوە بیردەکەنەوەو هەڵسوکەوت دەکەن؛ توانای خۆیان بە دژی توانای من دانانێن، هەتا هێزو تواناییان زیاد بێ، زیاتر هەست بە توانایی من دەکەن، چونکە توانای تێگەیشتنیان پتەوتر دەبێت. هەڵبژاردنی پەنای من بۆ جێی حەوانەوەی دڵتان قازانجی منی تێدا نییە، من سەرچاوەی هەموو شتێکم، هیچم لە کەس ناوێ، پێویستم بە کەس نییە، بەڵام دەبێ وەك خوایەکی راستەقینە چاکترین و خۆشترین و پڕ قازانجترین ومسۆگەرترین ڕێگاتان بۆ دەستنیشان بکەم. دایکان و باوکان ئومێدی باشترین ژیان بۆ رۆڵەکانیان دەخوازن، ئێوە بەندەی منن، بەدەستی خۆم دروستم کردوون، گەڕانەوەی هەر یەکێکتان بۆ

یەکێکتان لای من لەوە خۆشترە بەندایەتی بۆ من
ڕێی بەختەوەری و بەندایەتی بۆ من لای من لەوە خۆشترە یەکێکتان
شتی گرنگ و بەنرخی ونبووی خۆی بدۆزێتەوە. هەموو ئەوانەی
لەگەڵیاندا دەژین ئێوەیان بۆخۆیان دەوێ!! بەڵام من ئێوەم دەوێ بۆ
بەرژەوەندیی خۆتان. کاتێك لە خاڵی گواستنەوەتاندا واتە ساتی
مردن بەرەوڕووم دێن، من هیچتان پێ ناڵێم، من لەگەڵ
بوونەوەرەکانی تر، لەگەڵ فریشتەکانم بەرەوڕووتان دەکەمەوە، با
ئەوان سەرسوورمانی خۆیان پیشان بدەن، با ئەوان پێتان بڵێن: چۆن
پەنای خواتان گۆڕیەوە بە پەنای دروستکراوەکانی؛ پشتتان لە
هەموو شتێك کرد و ڕووتان لە هیچ کرد. لە ژیانی هەموو
مرۆڤێکدا خۆشەویستێکی پلەی یەکەم هەیە، کە بەکەسی تری
ناگۆڕێتەوە، جوانیی تێدا دەبینێ، یان دەوڵەمەندیی تێدا بەدی
دەکات، یان خاوەن هێز وتوانایە، یان زۆر جاریش لەبەرئەوەی
ئارەزووپەکانی دەروونی و پێداویستییەکانی لەشی بۆ جێ بەجێ
دەکات. ئینجا لەبەر بەرژەوەندیی خۆتان دەبێ پێتان بڵێم و
ڕاستییەکانتان بۆ ئاشکرا بکەم: هەرگیز کەس لەمن جوانتر نییە!
چونکە من سەرچاوەی هەموو جوانییەکانم، کەس لە من دەوڵەمەنتر
نییە! چونکە من خاوەنی زەوی و ئاسمانەکانم، بە ویستی من هەژار
دەوڵەمەند دەبێت و دەوڵەمەند هەژار دەبێت؛ من خاوەنی ئاو و
هەوا و خۆڵ و دەشت وبیابان و سەیرانگە و شاخ وداخ و درەخت و
سەرجەم بوونەوەرانم"کەس لە من بە تواناتر نییە!، هەموو زەوی
دەخەمە ناو دەستم و هەموو ئاسمانەکان دەپێچمەوە و دەیانخەمە بن
دەستم. کەس منی نەدیوە، چونکە هاوتا و هاوشێوەم نییە، بەڵام

پەیمانم بە خۆشەویستانم داوە خۆمیان پێ پیشان بدەم، دیداریان لەگەڵمدا هەبێ و ببینن؛ ئەوەش پاداشتێکە لە منەوە بۆ ئەوان، هەرچەندە رۆژی پێنج جار لە دونیادا بەدڵ و دەروونیان رووم تێدەکەن وتامی خۆشەویستیم دەچێژن. تەنیا خۆشەویستانی من خەم و حەسرەت و خەفەت ناخۆن، پشتیان بە من قایمەو لە دونیادا ئەوەی بە گومڕابووەکان دەدەم لە خۆشییەکانی جەستە و ئارەزووەکانی نەفس، بەوانیشی دەدەم و ئەوەی لەگەڵ تەندروستیی لەشیان ناگونجێ، هەر بۆ بەرژەوەندی ژیانی دونیایان لێم قەدەغەکردوون، بەڵام ئەوەی ناوی خۆشیی راستەقینەیە کە ژیانی ناو بەهەشتە، تەنیا بۆ ئەوانە، و دوژمنانی خۆمی لێ بێبەش دەکەم و دۆزەخ دەکەمە دوا چارەنووسیان . سیفەتی خوای راستەقینە ئەوەیە کە پێویستی بە خۆشەویستیی کەس نییە، پێداویستیی بەندەکانی جێ بەجێ دەکات، بەڵام پێی ناخۆشە کەسی نەشیاو جێگەیەك لەناو دڵی دروستکراوەکانیدا بگرێ. هیچ رەوا نیە پشت لەو خوایەی پێکهاتەی مرۆڤایەتی پێداون و روو لەو شتانە دەکەن کە مرۆڤایەتیتان لێ دەسێنێ)).

## دروستبونی ئاواتێکی نوێ

لەناو ئەم دڵفڕینەوەیە لە نێوان بەهەشت و بارەگای خوادا و پێش بڕیار وەرگرتن بە هەنگاونان بەرەو ڕێی خۆشەویستانی خوا، پیاوێك خۆی کرد بە بەهەشتدا. هەرچەندە بەکزی هاتە ژوورەوە سیمای خانەدانیی و پایەداریی پێوە دیار بوو، چاوی بەناو هەموو لایەکی بەهەشتدا دەگێڕا، بەڵام سەرسوڕمانی پێوە دیار نەبوو، هەرچی خزمەتکارانی بەهەشت دەوریان دابوو، بە جلی جوان و ئاوی سازگارو شەرابی ڕەنگاو ڕەنگ و خواردەمەنیی جۆراو جۆرەوە پێشوازییان لێ دەکرد، کەچی ئەو گوێی پێ نە دەدان. دیاربوو بەدوای شتێکی تردا دەگەڕا، لەپڕ سەری بڵند کرد و رووی کردە ئاسمان و پاڕایەوەو گوتی: ((ئەی ئەو کەسەی لە دونیادا بەدوای ڕەزامەندی ئەودا پیشبڕکێم دەکرد، لە خێرخوازی و چاکەکردن و گەیاندنی سوود بەخەڵکی! ڕۆژم دەخستە سەر شەو بۆ تێرکردنی هەژاران و فریاکەوتنی لێقەوماوان و کەم دەرامەتان، لە دونیادا خێرخوازیم بەنهێنی دەکردو ئاشکرام نەدەکرد، تا هیچ هاوبەشت لە دڵمدا بۆ دروست نەکەم، بەڵام گەورەم! ئیستا دەبێ دەنگی زەلیلیم دەنگبداتەوە، کە من هێشتا بەو ئەنجامە سەرەکییەی ئەو کۆششە

نەگەیشتووم، تۆ هەر خۆت دەزانی من لە پێناوی چ ئامانجێکدا هاتوومەتە بەر دەرگای ڕەزامەندیت، هەر خۆت دەزانی من چیم دەوێ، دڵم بەچی دەحەوێتەوە! شەراب و خواردن و خواردنەوەی من چییە! من چی لەمانە بکەم! کوا ئەو دڵەی تامی ئەم شتانەی پێ بچێژم؟ تا بەدیداری خواوەند نەگەم چی لە دروستکراو بکەم، تا لە دراوسێ دڵنیا نەبم خانووم بۆ چییە؟ تا هاوڕێی چاك بۆ خۆم پەیدا نەکەم، چۆن ڕێگای دوورو درێژ بگرمەبەر؟ جارێ با لە ڕەزامەندیی تۆ تێربم، با ئەو دڵەی لە دونیادا لە خۆشەویستی تۆ توایەوە، ئەمڕۆ لەناو روباری ڕەزامەندیت مەلە بکات، با ئەو چاوەی فرمێسکی حەسرەتی دووری لە تۆی دەڕژاند بە دیدارت شاد بێ، با ئەو گوێیەی لە بیستنی غەیری دەنگی وشەکانت داخرابوو بە بڕیاری ڕەزامەندیت بکرێتەوە، با ئەو سیینەی بە هەوای غەیری یادی تۆ و یارانت لە دونیادا هەناسەسوار دەبوو ، بە شەماڵی لێبوردنت هەناسە وەربگرێ، ئەو دەمەی بە یادی تۆ لە دونیادا تەڕبووبوو داوا دەکا ئەمڕۆ بە شەرابی ڕەزامەندیت تەڕ ببێ، بەڵکو هەست وهۆشم بۆ بگەڕێتەوەو بتوانم تامی خۆشییەکانی بەهەشت بچێژم، من تەنیا ڕووم کردۆتە تۆ ولە بەندەکانت دڵم تەنیا موحەممەدی پێغەمبەری ویستووە ، چەندەها ساڵە وا چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم کە بەدیداری پێغەمبەر شاد بم، پێش باوك و دایکم خوازیاری بینینی سیمای ئەوم، دەرفەتم بدە - ئەی خوایە- بەرامبەر ئەو خۆشەویستە

ڕاستەوخۆ هەستی خۆمی بۆ دەربڕم ، بەڵکو تۆزە فێنکاییەك لە بیابانی چاوەڕێکردنی بینینی ئەو خۆشەویستە بەدڵمدا بێتەوە. ئەی پایەبەرز! ئەی موحەممەد ! ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ڕابەری باوەڕداران وخواناسان! ئەی بەرزترین نموونەی مرۆڤایەتی! تاکەی لێت دووربم ؟ پێم ناڵێی - ئەی مایەی ئارامشی ڕەوانم - کەی بە دیدارت شاد دەبم؟ کەی کەوسەری زەردەخەنەی سەر لێوەکانت تینواتی وجودم دەشکێنێ و کلپەی ئاگری دووری تۆم لە دڵدا ڕۆدەمرکێنێ ؟ دڵم نەما، کۆشکی ئارامیم ڕما، چاوم لە فرمێسکی یادکردنت پوا، جوانی تۆ لە جوانییەکانی هەموو دروستکراوانی خوا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵام...! چی لەم دڵە بکەم ؟ هەر تۆی دەوێ؟ عاشقی جوانیە ڕەسەنەکانە، کاتێك ناوی پیرۆزی تۆ بێ، یان وشەی عیشق و خۆشەویستی هونەرمەندێك ببیسێ، ئینجا وەرەو سەیری حاڵی ئەم دڵە بەستەزمانە بکە! خۆزگە تەنیا کێشەی دڵ بوایە، دەمتوانی سۆزەکانی لە خەڵکی بشارمەوە، بەڵام فرمێسکی چاوەکانیشم دوای ناو بردنت وا لەناو خەڵکدا ناوزڕم دەکات، ناچارم زوو بەزوو بیانسڕمەوە. سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا، دەبێ بمانناسی؟ دەبێ بە حاڵی دڵمان بزانی؟ دەبێ ئەم هەست وسۆزانە بگەن بە تۆ؟ بێگومان دەگەنە تۆ، بەڵام گرفت ئەوەیە پەردەیەکی ئەستوور لەنێوانمانە، پەردەی غەیبە و ناچارین چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بکەین ئەو پردەیە لابرێ، بەڵام هەتا ئەو کاتە نازانم چی لەم دڵە

بکەم، بەچی ئەم فرمێسکانە ڕابگرم؟ خوایە چارەیەك ! خوایە تیمارێك! خوایە بۆ کێشەی دووری لە پێغەمبەر چارەسەرێك!

خوای گەورە پێی فەرموو: ئەی خۆشەویستم! تۆ هەڵبژاردەی ئێمەی، دەمێکە هەنگاو بەهەنگاو چاودێری دڵت دەکەین، دوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە شایانی ئەوەی ببیتە یەکێ لە خۆشەویستانمان، بەهەشت پاداشتێکە لەو پاداشتە زۆرانە کە بۆمان ئامادەکردووی، دەبێ وەریبگری، ئینجا لە نزیکیمان هەرگیز بێ بەش نابی. ئێوەی خۆشەویستانی من، بوون بە بەڵگەیەکی روونی من لەسەر ئەوانەی تەگەرە دادەنێن لەبەردەم گەیشتن بە ڕەزامەندیم، لەسەر ئەو ئادەمیزادە لاوازانەی کە غەیری من بە گرنگتر دەزانن، بۆیە روو لە غەیری من دەکەن، هەوڵی فەرامۆشکردنی لەزەتێکی نەفس، یاخود گلەییەکی خەڵکیان لەپێناو ڕەزامەندی منیان نەداوە، دڵنیات دەکەمەوە – ئەی بەندەم - کە پێغەمبەر ئاگای لە هەنگاوەکانتانە، ڕێم پێ داوە بەدواچوونەوەی کارەکانتان حەفتە بەحەفتە بکات ، ئەوەی بە دڵ بێت سوپاسی من دەکات لەسەری و زۆر پێی خۆش دەبێت و ئەوەی لەگەڵ ڕەزامەندی من ناگونجێ داوای لێبووردنم لێ دەکات، هەرگیز هیچ خەمخۆرێکی دڵسۆزی وەك پێغەمبەرتان دەست ناکەوێت. بەندەی خوا فەرمووی: ئەی خوای من و هەموو جیهانەکان! ئەوانەی پشت لە تۆ دەکەن تۆ باش ناناسن، گەر بتناسن، ئامادە دەبن هەموو جیهان بکەنە قوربانی گەیشتن بە

بارەگای ڕەزامەندی و خۆشەویستیت، هەرچەندە دەزانم - ئەی خوایە - کە تۆ لە هەموو وشە پیرۆزەکانت بە تێرو و تەسەلی خۆت ناساندوە بە بەندەکانت، تەنانەت ئەم جیهانانە گەورەترین بەڵگەن لەسەر مەزنیت، گەرچی دڵ زۆرەملێی لێ نەکرێت و لێی گەڕێت، ڕاستەوخۆ ڕوو لە تۆ دەکات، لە تەنگانەدا هەموو خواوەندە دروستکراوەکان دەتوێننەوەو هەر تۆ پەنای ڕاستەقینەی بەندەکانتی، بۆیە هیچ بیانویەکیان نییە. سوپاسیش بۆ ئەو پێغەمبەرە نازدارەی پێشکەشت کردووین.

برادەرە ئازیزە پلە بەرزەکەم جێ هێشت و ڕووم لە خۆم کرد: ئەوا یەکێکی ترم بینی ئاواتی لە من بەرزتری هەیە، دەبێ ئەم جۆرە کەسە کێ بێت ئامانجەکانی لە ئامانجەکانی من گرنگتر بێت؟ لە دانیشتوانی بەهەشتم پرسی ئەوانیش گوتیان: ئەمە یەکێکە لەوانەی لەدونیادا لەبەر خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوای گەورەو پێغەمبەر کاری دەکرد، نەك تەنیا لەترسی دۆزخ و لەتەماعی چوونە ناو بەهەشت، بەڵکو تەنیا رووکردن لە خوای دەویست، چونکە دەیزانی خوا سەرچاوەی بەهەشت و هەموو دەستکەوتەکانە.

# بڕیار و دەستکەوت

بەرامبەر بەو وشە جوانانە و بەرامبەر ئەو راستییە سەرسوڕهێنەرانە،منیش بڕیارمدا ئاخیرەت لە تەنیشت دونیادا بنێم و رووبکەمە خوای دونیاو ئاخیرەت. بەخششی خوایی لەهەنگاوەکانی من زۆر فراوانتر بوو و بانگی دڵی دەکردم: ((ئەی بەندەم! دەبێ بزانی، کە ئەوەی روو لە من بکا، دەبێ لەهەموو کەسێکی تر زیاتر قازانج بکات. ئەوا دونیا و ئاخیرەتم بۆ کردی بە دوو خزمەتکارو ئەوەش پاداشتی منە بۆ ئەوانەی تەنیا خۆشەویستی و رەزامەندیی منیان دەوێ)).

خوا کە ببەخششی بە جوانترین شێوە دەبەخشێ. سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەهەشت و نزیکبوونەوە لەخۆی بۆ کۆکردمەوەو منی گواستەوە بۆ بەرزترین پلەی بەهەشت، هەر چوار لام خۆشی دڵ و دەروونە، بنمیچەکەشم عەرشی پەروەردگاری باڵادەستەو دڕاوسیەکەشم بەرزترین نموونەی مرۆڤایەتیە.

# دوو کۆسپ

ئەو پلەوپایە بەرزە تەنیا بە ئاوات و قسەزانییەوە نەهاتە دی، بەڵکو دەبوایە لە دوو کۆسپ تێپەڕ ببام، کە یەکەمیان داخوازییەکانی دەروون بوو.

داوەکانی ئارەزووەکانی دەروون، باڵەکانی توند پێکەوە گرێ دابووم و نەیاندەهێشت بەئاسانی بەرەو ئاسمانی خۆشەویستی خوا بفرم، چونکە نەفس چاوچنۆکەو هەرگیز تێر نابێ و ئەوانەی دوای ئەو فەلسەفەیە کەوتوون، کە دەڵێت : ((مرۆڤ دەبێت روو لەهەموو لەزەتێك بکا بۆ ئەوەی تێر ببێ و دواتر بەرهەمی زۆر دەبێت)) ئەوانە بەهەڵەدا چوون، چونکە بەپێچەوانەوە نەفس زۆری دەوێ بۆ ئەوەی تێر ببێت، ئەو کاتەی لە هەموو لەزەتێك تێر ببێ تووشی خەم و خەفەت دەبێ و ئەنجامەکەی کوشتنی هەموو ئاواتەکانە ؛ ئەوەش هۆی سەرەکی زۆربوونی خۆکوشتنە لە جیهاندا. باشترین رێگا بۆ بەرهەم هێنان و بۆ دوورکەوتنەوە لە بوون بە دیلی ئارەزووەکانی نەفس، رکێف کردنی نەفسە (نە داپڵۆسین و فەرامۆشکردنی پێداویستیەکانی و نە بەرەڵاکردن و جێ بەجێ کردنی هەموو داواکارییەکانی) ؛ هەروەها یەکەم هەنگاویشە بۆ گەیشتن بە خواوەند. ناسیاوێکم هەیە تووشی نەخۆشی شەکرە بووە.

دەڵێت: جاران بەئارەزووی خۆم شیرینیم دەخوارد، واتەمرۆش لەبەر ئەم نەخۆشییە جار بەجار پارچەیەکی زۆر بچووك لە شیرینی دەخۆم. هەروەها دەڵێت : باوەڕکە ئێستا زیاتر تام وچێژ لەو شیرینیە دەکەم!

ماڵئاواییم لەهەموو داواکارییەکانی نەفس کرد، تەنیا پێداویستییە گرنگەکانی نەبێ و پێم گوتن: لەم بیابانە تاریکەی دووری لە خوا، تروسکەیەکی پڕشنگدارم بەرچاو کەوتووە، ئەگەر خوای من و ئێوە دەرفەتی پێدام و رازی بوو ئەوا جاربەجار دەگەڕێمەوە لاتان و ئەو بەشەی لە قەدەری خوا بۆتان نووسرابێ دەتاندەمێ، ئەوەش لەبەر ئەوەی خوا پێی خۆشە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی وەربگرێت - با داواکارییەکانی نەفسیش بێت - ئەوەش بەداخوازییەکانی دونیایی ناژمێردرێ، چونکە ئەوە پێداویستیەکانی نەفس ومافە رەواکانی ئادەمیزادە. ئەو دونیایەی کە دەبێ فەرامۆش بکرێ، ئەو کارەیە کە لە ناسینی خوا دوورت دەخاتەوە، واتە ئەگەر هەموو دونیا لەناو دەستمدا بێ و دڵم لەگەڵ خواوەند بێت، هەر بە بەندەی خوا دەژمێردرێم و لە بازنەی خواناساندا دەرنەچوومە.

خەڵك کۆسپی دووهەم بوو واتە سەیرکردنی خەڵك بە چاوی دەسەڵاتدار. لەترسی ئەوان وەرگرتنی بڕیارێکی سەربەخۆ بۆ چوون بەرەو بارەگای خوا کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام لەپەنای خوادا تێگەیشتم کە غەیری خوا کەس هیچی بەدەستەوە نییە، من بۆیە رووم کردە بارەگای خوا، چونکە تەنیا ئەو شتی بەدەستەو ئەوە سەرچاوەی مردن و ژیان و خۆشی و ناخۆشی و زیان و قازانج و

بەخشین و دەستگرتنەوە و گریان وپێکەنین و دەوڵەمەندی وهەژاری و تەنانەت هەموو دڵی خەڵکی لەناو دەستی ئەودایە و بەپێی ویستی خۆی دەیانسوورێنێ. ئەو هەستە بەرزە وای لێکردم ئازاد بم لەکاتی بڕیاروەرگرتن و رووم هەر لە بارەگای رەزامەندی خوا بێ و لە پشت بەستن بەغەیری خوا دووربمەوە.بەڕینەوە بەسەر ئەو دوو کۆسپەدا منی گەیاندە ئەو پلە بەرزە.

لە شەو و رۆژێکدا خۆم بەرامبەر بە دەیان یاخود سەدان بڕیاردا دەبینییەوە، بڕیارێکی بچووك وەك جل گۆڕین، یان بڕیاری گەورە وەك بەخشین بە کەسێك، کە هەمیشە ناخوێنێتەوەو مافەکانم پێشێل دەکات هەمیشە ئەو بڕیارەم وەردەگرت کە لەگەڵ رەزامەندی خوادا دەگونجا، گوێم نەدەدایە چرپەکانی نەفس یاخود فشار وحەزی خەڵکی..!

# هەستێکی نوێ

لابردنی ئەو دوو تەگەرەیە - ئارەزووەکانی نەفس لەلایەك و چاوبڕینە دەستی خەڵکی لەلایەکی تر- پێش نزیکبوونەوە لە بارەگای خواوەند لەسەرەتادا کارێکی ئاسان نەبوو ، چونکە من نەك بەرەو لێژی بەڵکو بەرەو بەرزایی و لوتکە سەردەکەوتم، بەڵام دوای ماوەیەك ئەم کارە لام بووە سیفەتێکی سروشتی. هەنگاو بەهەنگاو هەستم دەکرد دڵم لەگەڵ فەلەکدا دەسووڕێتەوە، میحرابەکەم لە چوارچێوەی مزگەوت دەردەچوو بەرەو ئاسۆی گەردوون، دڵم وەك باڵندەیەك لە فڕین دا... بەناو ئەستێرەو هەسارەکان، بەناو بەهەشت و دۆزەخ، لەگەڵ جنۆکە وفریشتەکان، گاڵتەم بە ئاواتە نزمەکانی دانیشتوانی سەرزەوی دەهات، ئەوانەی راکردن بەدوای پارەوسامان و پۆست و کورسی تەواوی ئامانجیان بوو، نەك بیانکەنە رێگایەك بۆ بەختەوەری خۆیان و دەوروبەریان و ئەوەش بەڵگەیەکی ترە کە مرۆڤ هەرگیز تێر نابێ.

دەتوانم بڵێم ئەم رێگەیە بەتەواوەتی رزگاری کردم، رزگاری کردم لە ملکەچی بۆ داواکارییەکانی نەفس، کە سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەکانە لە ژیانی ئادەمیزادا؛ رزگاری کردم لە هەست کردن بە لاوازی بەرامبەر بە خەڵك. ئێستا بەشێوازی راستەقینەی خۆیان

دەیانبینم، دەیانبینم تەنیا پارچە گۆشتێکن لەسەر زەوی‌و سبەینێ من و ئەوانیش دەبینە خۆراکی مێروولەکان؛ بەڵام ئەو هەستە رێگر نەبوو لەبەردەم رێزلێگرتنیان و مافدان بە خاوەن مافەکان، هەروەها هەستم بە لووتبەرزی بەرامبەریان نەدەکرد.

هەستێکی تری نوێم بۆ پەیدا بوو و ئەویش ئەوەیەکە دەبێ تەنیا بۆ خۆم نەژیم، چونکە کاتێ بۆ خۆم دەژیم ژیان زۆر کورت و بچووک دەبێ و لەو خاڵەوە دەست پێدەکات کە هۆشم دەست بەکار دەبێ و بە کۆتایی تەمەنم ئەو ژیانەم کۆتایی پێدێت. بەڵام گەر بۆ رێبازێك بژیم ژیان زۆر فراوان و قووڵ و درێژخایەن دەبێت، تەنانەت پاش بەجێ‌هێشتنی ئەم سەرزەمینە، دووهێندەی تەمەنی خۆمم دەست دەکەوێت بگرە زیاتریش. دەستکەوتنێکی راستەقینەیی نەك خەیاڵی، چونکە هەستم بە رۆژ و سات و چرکە دووهێندە دەبێت. ژیان بە ژماردنی ساڵ و رۆژ نییە، بەڵکو بە هەست ژماردنە. ژیان بریتییە لە هەست کردنی مرۆڤ بە ژیان؛ هەر مرۆڤێك رووتی کەیەوە لە هەستکردن بە ژیان، ئەنجامەکەی رووتاندوەی لە مانای راستەقینەی ژیانە.

هەروەها پێشکەشکردنی کاتی خۆم بۆ دەور و پشتم هەست بە خۆشی ژیانم زیاد دەکات، بۆیە بەردەوام بووم لە بەخشینی خۆشی و ئاسوودەیی بە خەڵك و درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆیان. هەستم

دەکرد ئەو خۆشییەی کە لەناو دڵمدا بە هۆی ئامانجی بەخشینی یارمەتی و خۆشی بە خەڵك پەیدا دەبوو لەو خۆشییە کەمتر نەبوو کە ئەوان هەستیان پێدەکرد، کاتێ یارمەتیی منیان وەردەگرت، لە جیهانی دەروونـدا هیچ جیاوازییـەك نـەدەما لـە نێوان پێدان و وەرگرتندا، هەر شتێکم دەدا خۆشـییەکی دەروونـیم لەبەرامبـەردا دەست دەکەوت . بۆ نموونە، بەسەدان جار من لـە چێشتخانەکاندا نانم خواردووە، تەنیا چێژی ئەو خواردنـە لـە دەروونمدا مـابوو کـە رۆژێك پارەی خواردنی هەژارێکم دا کە دەستی نەبوونی بـۆ خـاوەن چێشتخانەکەی درێژکردبوو.چێژی سەدان وهـەزاران خـواردن نـەما، بەڵام نەمری هەر بۆ چێژی خزمەتی بەرامبەر لە پێنـاو رەزامەنـدی خوا دەبێت. گەیاندنی کەسێکی بەساڵاچوو کە ماڵی خۆی ونکردبوو بە ئۆتۆمبیلەکەم، بێ بەرامبەر، لە خۆشییەکەی ئەو زۆرتر بوو کـە بە ماڵی خۆی شاد دەبووەوە. ناتوانم ئەو خۆشییەتان بۆ وەسف بکەم بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم کە خۆشییەکی نەمر و زیندوو بوو.

# لەبەردەم بارەگای خوای باڵادەستدا

پێم هەڵێنەدەگرتم کاتێك کە دڵم گەیشتە ئاواتی ئاواتەکان، ئامانجی ئامانجەکان، واتە کاتێك کە گەیشتە بارەگای خوای مەزن. هەندێ لەو کەسانەم دەدی کە لەو بارەگا پیرۆزە دەهاتنە دەرەوەو سیمای بەختەوەری و شادمانی بەڕوویانەوە دیار بوو. پێم گوتن: ئەی ریزداران! پێم نالێن چی لەژوورەوە هەیەکە وای لێ کردوون رووگەش بن؟ یەکێکیان گوتی: قوربان! ئەوەی لەژوورەوەدا هەیە، هەرگیز بە وتە باس ناکرێت، هیوادارم تۆش لێی بێبەش نەبیت. گوتم: ئەی بەڕێز! چۆن دەستم دەکەوێت؟ وتی: دان بەخۆتا بگرە و بەردەمی ئەم دەروازەیە بەرمەدە و بەجێیمەهێڵە، هەتا رێ بە دڵت دەدرێ بچێتە ژوورەوە. وتم: ئەی ئێوە بۆ کوێ دەچن؟ وتی: ئێمە ژمارەیەکین لە خۆشەویستانی خوا وراسپاردراوین کە بگەڕێینەوە ناو ئەو خەڵکانەی کە لە کاروانی رێگای خوا دابڕاون؛ ئێمە شارەزای رێگاوبان بووینە و ئەو شارەزاییە بۆ رزگار کردنی ئەو خەڵکە بەکاردێنین. هەندێکیان خەریکە لە دەریای دونیادا نوقم دەبن ومەلەوانی نازانن، هەندێکیشیان رێگرەکان رێیان پێگرتوون و خەریکە چەواشەیان دەکەن، وا ئێمەش دەچین رێنماییان بکەین و

ڕێی ڕزگارییان پیشان بدەین. گوتم: ئەگەر لە بارەگای خۆشەویستانی خوا دووربکەونەوە دڵتەنگ نابن؟ گوتی: ئیمە کە تێکەڵ بە خەڵك دەبین دڵمان لێرەدا بەجێدەهێڵین، هەستکردن بەخۆشیی نزیکی لە خوا لامان بەردەوامە، نە ترس دێ بەدڵمانداو نە خەم و نە خەفەت. ترس و خەم و خەفەت فەرمانی دڵە، ئێمەش دڵمان لەپەنای خوادایە، لەپەنای لابەری ترس و خەم و خەفەتدا بەجێهێشتووە.

بە ڕاستی ئەو ئاواتە لە دڵمدا دروست نەبوو کە وەك ئەوان بم، هەرچەندە ئەوان بەرەو پلەیەکی بەرزتر دەچوون. جارێ ئاواتی چوونە ژوورەوەی بارەگای خوا سەرقاڵی کردبووم، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی تر من دەبێ بەدیداری خوا شاد بم، ئینجا روو بکەمە خەڵکی بۆ ئەوەی بانگەوازەکەم بۆ خەڵکی هەر قسەو خەیاڵ نەبێ. دەبێ ماڵ و خواردن و خواردەمەنی ئامادەبکەم و ئینجا خەڵك دەعوەت بکەم.

# ئەنجامی چاوەڕێکردن ودان بەخۆداگرتن

لە قاپی بارەگای خۆشەویستانی خـوادا زۆر وەسـتام، هەستم کرد جۆرە خۆشییەك وردەوردە ناو دڵم دەگرێتەوەو دڵنیاشبووم کە لە دیوی دەرەوەم هەتا ئەو ساتەی دەستێکی نـەرمی وەك ئاوریشم و بۆندار وەك نێرگز دەستم دەگوشێ و دەفەرمووێ: مـن موحەممەدم، پێغەمبەری خوام و بەرپرسی دەرگای بارەگای پەروەردگارم، رابەری خۆشەویستانی خوام، من دەزانم لـە چاوەڕێکردنی تاقـە پڕۆکێنـەر دڵتـەنگ بویـەتی و ناهەقیـشت نییـە؛ بـەڵام پـەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی بەردەوامی ئامۆژگارییەکانم تۆی گەیاندە ئەم ئەنجامە گرنگە، جا وەرە باپێکەوە بچینە جیهـانی ئـەوینی راسـتەقینەیی، وەرە لەگەڵم و دەست لەناو دەست بابچینە ژوورەوە!

باوەڕبکەن هیچ جۆرە هەستێکم نەما، دوای خۆشەویستی خـوا حەزرەتی موحەممەد(درودو سەلامی خوای لەسەر بێ)کەوتم و لەبەر دەرگادا دەنگێگ بەرگوێی دڵم کەوت و فەرمووی: ئەی موحەممـەد! ئەی خۆشەویستم! ئەی رابەری باوەڕداران! دەرگـای داواکردنـت بـۆ کراوەتەوە. ئەویش فەرمووی: ئەی خوای گـەورە! ئـەوە بەندەیـەکی خۆتە، خۆت دەزانـی دەمێکـە لەبـەر دەرگـادا وەسـتاوەو لەمێژە

پەروەردەی دەکەم بۆ خزمەتکردنی ئەم ڕێگایە، دەزانیٚ شوێنکەوتنی من ئەنجامەکەی ڕەزامەندیی تۆی تێدایەو خۆت دەزانی ڕادەی جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانتی چەند بەجێهێناوە، لێت دەپاڕێمەوە کە ڕەزامەندیی خۆتی بەسەردا بڕێژی و دەرفەتی بدەی لەناو بارەگای خۆشەویستانتدا دڵشاد بێت. پێویستم بە وەڵام نەبوو چونکە ئەو دڵنیاییەی کەوتە ناو دڵم بەڵگەیەکی ئاشکرابوو لەسەر وەرگرتنم لە ناو خۆشەویستانی خوا. یەکێك لە شارەزایانی ئەم ڕێگایە دەڵێ: گەیشتن بە پلەی خۆشەویستانی خوا ڕاستەوخۆش دەبێت، بەڵام ئەگەر دەستت بخەیتە ناو دەستی پێغەمبەر (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت) واتە دوای ڕێگاکەی بکەوی زووتر دەگەیە ئامانجەکەت.

پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا بەجێبهێڵم رووم تێکردو لێم پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا! من دەزانم گەورەترین ئاواتت گەیشتنی ئێمەیە بە ڕەزامەندی خواو پلە بەرزەکانی بەهەشت، ئایا ئاواتی تایبەتی جەنابت دەبێ چی بێ ؟ فەرمووی: ئاواتی تایبەتی من ئەوەیە پلەی ((الوسیلە))م دەست کەوێ، ئەم پلەیە بەرزترین پلەیەکە بەندەیەکی خوا دەستی دەکەوێ، ئەو پلەیە بۆ یەك کەس تەرخانکراوە، هیوادارم من ئەو کەسە بم. هەمیشە داوای دەست کەوتنی ئەم پلەیەم لە خوا بۆ بکەن، گەر دەستم کەوێ بەڵێنتان دەدەمێ پاڵپشتان دەبم بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا. هەزار هەزار سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا ، هەمیشە هەوڵت داوە

قازانجمان پێ بگەیێنی، تەنانەت لە بەدیهێنانی گرنگترین ئاواتت!

ئای رێگای ناسینی خوا چەند پان وبەرین و بەرفرەوانی! سنوورێك نییە مرۆڤ تێیدا بوەستێ. داواکارانی دونیاو غەیری خوا لە بازنەیەکی زۆر بچووکدا دەسوورێنەوەو ئاواتەکانیان لە خۆیان بچووکترە، بەڵام ئەم رێگایە هەرگیز وەستان و ساردبوونەوەی تێدا نییە؛ لە خۆشییەك بۆ خۆشییەکی بەتامتر، لە ئاسۆیەك بۆ ئاسۆیەکی روونـاکتر، لە ئاواتێکەوە بۆ ئـاواتێکی بەرزتر، لە رێگایەکەوە بۆ رێگایەکی پان وبەرینتر. هەر هەنگاوێکی ئەم رێگایە بۆ خۆی پارچە بەهەشتێکە، بەهەشتی نزیکی ناو دونیا. وامدەزانی بەهەشت هەر ئەو بەهەشتەی دوای مردنە، بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە نزیکبوونەوە لە خوا، نزیکبوونەوەیە لە بەهەشتی دەروونی ناو دونیا؛ بەڵام دوورکەوتنەوە لە رەزامەندی خوا، نزیکبوونەوەیە لە دۆزەخی دەروونی ناو دونیا. وادیارە ئەم بەهەشتە وئەو دۆزەخە پاداشت و سزادانەوەی دەم و دەستی ناو دونیایە. هەنگاوی دوور لە رەزامەندی خوا بە رواڵەت شیرینی پێوە دیارە، بەڵام ئەوە شیرینییەکی کاتییەو ئەشکەنجەی دەروونی بەدواوە دێ. بەڵام هەنگاوی نزیك لە رەزامەندی خوا بە رواڵەت تاڵی پێوە دیارە، بەڵام ئەو تاڵییە کاتییەو شیرینییەکی بەردەوامی بەدواوە دێ. وەکو دەڵێن: تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە، یەك جار لەپێناوی رەزامەندی خوا هەنگاوێك بنێ (بچووك بێ یان گەورە) و سەیری

خۆشیی ناو دەروونت بکە، ئینجا خەفەت بۆ ئەو تەمەنە دوورو درێژەت بخۆ کە لە پێناو ڕەزامەندیی خوا بەکارت نەهێنا. یەکێک لەوانەی کە تامی لەزەتی نزیکی لە خوایان چەشتووە دەڵێ: گەر دوژمنانمان لەزەتی نزیکبوون لە خوا بچێژن، بێگومان لەسەر ئەو لەزەت و خۆشییە شەڕی مان و نەمانمان لەگەڵدا دەکەن!!

# هەستێکی نوێی گرنگتر

بەڕاستی هەر لەو ساتەوە دڵم لەهەموو شتێکی تر دابڕا، جگە لە خواو پێغەمبەرو خۆشەویستانی خواو ئەو کارانەی کە خوا پەسەندی کردوون، هەستم بە کات نەدەکرد. رق و کینە لەدڵمدا تواپەوە. رووبەری خۆشەویستیم بۆ مرۆڤایەتی و دەشت و دەرو زەوی و ئاسمان وشاخ و داخ فراوانتر بوو، نە دوژمنم ما و نە دۆست، چونکە کە کەس قازانجی منی بەدەست نەبێ دۆستم بۆچییە. کە کەسیش زیانی منی بەدەست نەبێ دوژمنم بۆ چییە، بەڵام، ئەوەی لەگەڵ خوا رێك بێ دۆستمەو دوژمنی خواش دوژمنمە. ئەوەیان دۆستی باوەڕمە، ئەمیشیان دوژمنی باوەڕمە. هەوڵ دەدەم ئیشەکانم جێ بەجێ بکەم بێ ئەوەی دڵم خەریك بێ بە هاتنە دیی ئامانجەکان، چونکە ئامانجەکان لە ژێر دەستی قەدەری خوادایەو تەنیا هەوڵدان ئەرکی ئێمەیە. ئەگەر ئیشەکانم پێ تەواو نەکران و تەمەنم کۆتایی پێ هات، دڵگران نابم چونکە دڵنیام ئەو هێزەی چاودێری ئەم گەردوونە دەکا، رێگەنادا بە مردنی بیرۆکەیەك کە ئاستی مرۆڤایەتی خەڵك بەرزبکاتەوە، بەڵکو کەسانی تری بۆ تەرخان دەکا تا تەواوی بکەن و بەئەنجامی بگەیەنن.

پێش جێ بەجێ کردنی هەر ئیشێك سەیری قەدەری خوا ناکەم بەڵام کە کۆتاییم بە ئیشەکە هێنا ئەوەی روودەدات ئەوە قەدەری خوایە؛ بەئەنجامەکەی رازی دەبم. کار پەیوەندی بە ئەنجامەوە نییە، کار ئەرکی ئێمەیەو ئەنجامەکەی بەدەست خوایە. ئەو دونیایەی کە پشتی تێدەکەم، خواردن و خواردنەوە وجل و بەرگ نییە، ئەم شتانەو دەیان شتی تر دەتوانم وەریان بگرم بە رێگایەکی گونجاو لەگەڵ رەزامەندیی خوای پەروەردگار، بێ ئەوەی دڵم لە خواناسین دووربخاتەوە. ئاستی ژیانی خواناسی لە ئاستی ژیانی دوور لە خواناسین بەرزترە، ژیانی خواناسین هیچ جۆرە بنەمایەکی ژیان فەرامۆش ناکات، بەڵام بەشێوەیەك وەریدەگرێ کە لەگەڵ بنەماکانی مرۆڤایەتی گونجاو بێ. ئەمانە و سەدان وانەی تر لەرێگای رەزامەندیی خوادا فێربووم، بەڵام گەورەترین وبەنرخترین دەستکەوتێکی ئەم رێگایە ئەوەیە کە هەستم بە بوونی خوا بتەوتر بوو. ئەو دەستکەوتە رزگاری کردم لە هەستکردن بە تەنیایی و فەرامۆشیی و یارمەتیدەری تەواوی من بوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا، واتە بۆ بەرزکردنی ئاستی مرۆڤایەتیم.

# بەدوای ئەرکێکی گرنگدا

زۆر کەسی دەوروبەرم دەبینی کە وەك من لەناو لەزەتی نزیکبوونەوەدا تواونەتەوە. لێتان ناشارمەوە مەترسییەکی هەبوو کە لەم پلەیە دابەزم و لەم بەهەشتە دەروونییەدا دەربکرێم. لەگەڵ ئەوەشدا لەخۆشم دەپرسی: تۆ بڵێی پلەیەکی تر لەم پلەیە بەرزتر هەبێت؟ لەناخی سەرقاڵبوون بەم پرسیار و سەرنجانەدا، هەستم بەدەستی موبارەکی پێغەمبەری نازدار کرد کە لەسەر شانم دەدا و پێم دەفەرمووێت: ((ئەی خۆشەویستی خوا تۆ بەزەییت نایەتەوە بەوانەی وا لەرێگادا ونبوون؟ ئارەزووت نییە ئەو خۆشییەی تێیدا دەژی پێشانی خەڵکی تریشی بدەی؟)). گوتم: ((بەڵێ ئەی خۆشەویستی خوا! بەڵام ئێرەم زۆر لا خۆشەو حەز ناکەم ئێرە بەجێ بهێڵم)). فەرمووی: فێرکردنی خەڵك پلەی مرۆڤ لای خوا بەرزتر دەکاتەوەو گەیاندنی یەك کەس بۆ پەنای رەزامەندی خوای گەورە لە هەموو دونیا بەنرختترە)).

بەڕاستی میهرەبانیی خوای گەورە بێ سنوورە، دڵی ئازادکردم لە دونیا وگواستییەوە بۆ ناو جیهانێکی بێ هاوتا، هەنگاو دوای هەنگاو دەستی میهرەبانی بەرەو پلەیەکی بەرزتر دەمبات. دوای

ئەو گەشتە چارەنووسسازەش، دەمکاتە فرۆشیاری ئەم بازاڕە بە نرخەو خەڵك لەدەست ناحەزانی مرۆڤایەتی رزگار دەکەم و رێ پیشاندەریان دەبم بۆ فیردەوسی یارانی خوا.

قۆناغی ئەم جارەم ئاسان نییە، دەبێ تێکەڵی جۆرەها ئادەمیزاد بم، بە نرخ وبێنرخ، سادە و لێهاتوو، گەنج و بەتەمەن، هەر یەکە و سروشتێکی دەروونیی تایبەتی خۆی هەیە،دەبێ بەنەرم و نیانی لەگەڵیاندا هەڵس وکەوت بکەم و خۆشەویستی و متمانەیی پێش وشەکانم کەوێ، دەبێ راستگۆ بم و لەگەڵیاندا پەیمان شکێن نەبم، ئەگینا گوێ لە قسەکانم ناگرن. هیچ جۆرە قازانجێکم لێیان ناوێ، تەنیا گەڕانەوەیان بۆ لای خوای پەروەردگار، من هەموو شتێکم هەیە و پێویستم بە غەیری خوا نییە .

ئەم بوارە تازەیە شتی تری فێر کردم ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر لایەنە باشەکانی ناو دەروونی خەڵکی زیندووبکەینەوە، زۆر لایەنی چاك دەبینین کە جاران دیار نەبوون، تەنانەت ئەوانەی بە رواڵەت بە ئادەمیزادی دڕندە یان کەم هەست لە قەڵەم دەدران. کەمێك بەزەیی هاتنەوە بە هەڵەکانیان یان بە هەرزەییان، گرنگیدانێکی راستەقینەیی (نەك بە رووکەش) بە گیروگرفتەکانیان، ئینجا بڕوانە ئەو کانیاوە چاکانەی ناو دەروونیان کە خۆشەویستی و متمانەیی پێت دەبەخشن بەرامبەر بەو گرنگیدان و سنگ فراوانییە کەمەی کە پێشکەشت کردوون، کاتێك بە راستگۆیی پێشکەشیان دەکەی.

بۆم دەرکەوت رەگی خراپەکاری لە دەروونی ئادەمیزادا زۆر قووڵ نییە، خراپەکاری جێگایەکی تەسکی گرتۆتەوە لە توێژی دەرەوەی دەروون کە لە ململانەی ژیان بەکاری دەهێنن. بەو متمانە و خۆشەویستی دەربڕینەش لەگەڵیاندا، ئەو توێکڵە تەنکە هەڵدەوەرێ و دەروونە پاکەکە وەك خونچەی تازەپشکوتو بە چاوی دڵ و دەروونت دەبینی. هەر کەسێك هەر چەندە خراپیش بێ یەك دوو چاکەیەکی وای دەبێ کە شایانی وشەیەکی جوان بێ کە دڵ و دەروونی پێ بکاتەوەو بەرەو جیهانی چاکبوونەوە بیبات. لەم بوارە پیرۆزەدا زەرەرمەند نەبووم، بەڵکو دەوڵەمەند بووم لە خۆشی و دڵنیایی کاتێك کە تۆوی خۆشەویستی و بەزەییم لە دڵی خەڵکدا چاند.

# ڕوو لە خەڵك كردن

وام بە باش زانی كاتێك ڕوو دەكەمە خەڵك، دەبێ بەوانە دەست پێ بكەم كە تەمەنیان هەیەو وپێیان بڵێم: هەتا كەی ئاوڕ لە پەروەردگارتان نادەنەوە؟ هەتا كەی ڕووی دڵتان ناكەنە ئەو هێزەی هەمیشە چاوی لێتانە؟ بۆچی تا پیرتر دەبن ئارەزووتان بەرەو دونیا بەهێزتر دەبێت؟ هەتا كەی باوەش بە دونیادا دەكەن؟ ئارەزوو پەرستی هەتا كەی؟ ئاواتی بچووك هەتا كەی؟ غەیری خوا هەتا كەی؟ تەمەن درێژی مەكەن بە بیانوو و بەربەست لەڕێی هەڵبژاردنی ئاواتی گەورەو هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئەو ئاواتانە. چارەنووس دەستنیشان كردن پێویستی بە تەمەنی كەم و زۆر نییە، لەم ساتەوە بڕیارێكی یەكلاكەرەوە بدەن بۆ گەڕانەوەتان بۆ باوەشی بەندایەتی خواوەند و رزگاربوون لە بەندایەتی غەیری خوا، بەرەو تامكردنی چێژی ژیانی شیاو بەم مرۆڤە خاوەن پلەو پایە بڵندە، روو لە ئاسمان بكەن و هەنگاوی یەكەم هەڵبنێن!

دەبێ بەگەنجان بڵێم: خۆتان لەسەر چی فێركرد، بە پیری لەسەری گەورە دەبن و وازی لێناهێنن، گوێ لە خاوەن ئەزموونەكان بگرن، با پێتان بڵێن كە ئەم دونیایە ناشێ ببێ بە دوا ئاواتتان، ئەم دونیایە ڕێگایەكە بۆ ژیانێكی خۆشتر. ئەی گەنج! تەمەنت وا

دەتوێتەوە کەچی لێی بێ ئاگایت!! مردن هەر بۆ تەمەن درێژەکان نییە، سەردانێکی گۆرستانی شارەکەت بکە، بە چاوی خۆت ئەو راستییە دەبینی. ژیانی بەردەستت بریتییە لە بڕیار وەرگرتن، ئەو بڕیارە هەموو ژیانی داهاتووت دەگۆڕێ، یان خوا و بەهەشت یان غەیری خوا و دۆزەخ. تەنیا تۆ دەتوانی لە نێوان هەموو دروستکراوەکانی خوادا بە ئازادی بڕیار وەربگری، نە زەوی، نە ئاسمان، نە شاخ، نە بیابان نەیانوێرا ئەم ئەرکە هەڵبگرن، نەیانتوانی بە ئازادی ئەرکی بڕیاری رووکردن لە خوا بخەنە ئەستۆ، چونکە ئەو بوونەوەرانە دەیانزانی سەرپێچی کردن لە فەرمانی خوا ئەنجامەکەی ترسناکە لەبەر ئەوە تاکە بڕیاریان وەرگرت کە بەهەمیشەیی بەندەی خوا بن، بەڵام تۆ لە هەموو کاتێکدا لە بڕیار وەرگرتن ئازادی، تۆ لەوان گرنگتر دەبی ئەگەر خوات هەڵبژارد، بەڵام لەوان نزمتر دەبی ئەگەر غەیری پەروەردگارت هەڵبژارد. فریشتەکانی عەرشی خوا دوورترین دروستکراوی خوان لە تۆ، بەڵام ئەوان بە بەردەوامی داوا لە خوا دەکەن یارمەتیت بدا لەسەر ئەو ئەرکەی پێت سپێردراوە و لە خوای میهرەبان داوای لێبووردنت بۆ دەکەن، چونکە ئەوان لە هەموو کەسێکی تر چاکتر دەزانن ئەو خوایەی داوات لێ کراوە بەندایەتی بۆ بکەی،کێیە، گەورەییەکەی چەندە، ئەوەش لەبەر نزیکییان لە خوا، ئاسمان لە ژێریاندا خەریکە لە ترسی خوا شەق ببات، کەچی تۆش بە دڵ ساردییەوە ئەم ئەرکەت وەرگرتووە بێ

ئەوەی لە چارەنووسەکەی وردبیتەوە. دەزانم هەنگاوی بوون لەگەڵ فەرمانی خوا کەمێك قورسیەکی تێدایە ، بەڵام تۆ بەهەشت دەکڕی، بڕۆ سەوای مەترێك زەوی بکە لە خۆشترین شوێنی شارەکەت بزانە نرخی چەندە، بستێکی ناو بەهەشت لە هەموو دونیا بەنرخترە! تا زووە بڕیار بدە کە هەنگاوەکانت لەگەڵ ڕەزامەندی خواوەند گونجاو بێ.

دەبێ بە ئافرەتان بڵێم: بەناوی رزگاریخوازی ئافرەتان رێی رزگاری راستەقینە ون نەکەن و لە رێی پەروەردگار دوورتان بخەنەوە. ئەو پەروەردگارەی کە کردوونی بە ئافرەت، ئەو دەزانی پێکهاتەی ئێوە چییە، پێکهاتەی بایۆلۆژی و دەروونی؛ هەر ئەو پرۆگرامی گونجاوی بۆ دارشتوون کە پڕبەپێستی ئەو پێکهاتە بایۆلۆژی و دەروونییە بێ. لەم رۆژانەدا وشەی«رزگاری» بەپێچەوانەی مانا راستەقینەکەی خۆی بەکار دەهێنرێ، کە بۆ مەبەستێکی نادیار و ئەنجامەکەی وەك وا دەبیینن گواستنەوەی پەیوەندی لە نێوان ئافرەت و پیاودا لە پێکەوە ژیان و دابەشکردنی مافەکانە بەپێی بنەماکانی مرۆڤایەتی و ئەرك خستنە ئەستۆ بۆ ململانەی رەگەزایەتی و کێ لەوی تر زۆرتر دەسکەوت وەردەگرێ!! جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان رزگاربوون لە فشارو لاوازی و داپلۆسین لەلایەك و رزگاربوون لە مرۆڤایەتی و پێداویستیەکانی لە

لایەکی تر، یەکەمیان رزگاری راستەقینەیی دەگەیەنێ، بەڵام دووهەمیان دەست بەردانە لەو بنەمایانەی ئادەمیزادیان کردووە بە مرۆڤ و لەوە رزگاری کردووە بچێتە ریزی ئاژەڵەوە.

ئەی ئافرەتانی سەر رووی زەوی! ئێوە وەك پیاوان جیاوازیتان نییە لە رووکردن بەرەو بارەگای خوا، ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان نیشتەجێی پلەبەرزەکانی بەهەشت بوون، چونکە خۆشەویستی خوایان هەڵبژارد بەسەر خۆشەویستی هاوسەرو ژیان و منداڵ و هەموو دونیا، پێش ملیۆنەها پیاو لە پلەی مرۆڤایەتی کەوتن و نزیکبوونەوە لە خوای گەورە.

ئەی ئافرەتان! سەیری ناحەزانی مرۆڤایەتی بکەن چۆن جوانی لەشتان بەکار دەهێنن بۆ رووخاندنی بنەماکانی مرۆڤایەتی؟ گەنجێك گەر مێشکی تەنیا بە جوانی ئافرەتەوە سەرقاڵ بێ، هەرگیز بۆ پێشخستنی ژیان هەوڵ نادات، وزەی ئیبداعی دەمرێت. زانستی نوێ ئەوە دەڵێت، دەڵێت: دڵ مێشکێکی بچووکە کونترۆڵی مێشکی گەورەی ناو کاسەی سەر دەکات، هەرساتێك دڵ سەرقاڵ بوو بە راکردن بەدوای لەزەت و خۆشی، ئەوا مێشك بەرێژەیەکی کەمتر ئیش دەکات. جوانی لەشتان داپۆشن با مێشکی گەنجان تێك نەدات. ئینزیمەکانی ناو خانەی لەشی گیانەوەر بە پەردەیەك داپۆشراوە، ئەو پەردەیە بەربەستێکە لەبەردەم دەرچوونی بێ سنووری ئینزیمەکانە بۆ ناو خانە، گەر ئەو پەردەیە بەهۆی کارێکی

نائاسایی (دەرەکی یان ناوخۆیی)!! بدڕێ ئەوا ئەو ئینزیمانە بەتێکرا دەردەچێ و ئەنجامەکەی تێکدانی ناو خانەو تەنانەت مردنیشی، کارەکانیان دەگۆڕێت لە بنیاتنان بۆ تێکدان و رووخاندن، پۆشینی لەشی ئافرەت هەمان رۆڵی ئەو پەردەیە دەبینێ.

ئەی ئافرەتان! جوانی لەشتان مەکەن بە پاچێك کۆمەڵی پێ برووخێنن. خوای گەورە زۆرەملی پێ ناخۆشە، تەنانەت ئەگەر زۆرەملییەکە رووکردن بێ بەرەو بارەگاکەی ئەو. ئێوە بەو جلە تەسکانەوە زۆرەملێ لە گەنجان دەکەن تا لە ناسینی خوا دووركەونەوە، بەرەو قووڵایی ژیانی جەستەیی دەیانبەن و لەو گێژاوەدا نوقمیان دەکەن، رووبەڕووی تووڕەیی خواش دەبنەوە. پلەی مرۆڤایەتی ئافرەت بەوە بەرز دەبێتەوە کە دوور بێ لە بوون بە ئامرازی رووخاندن، بەوەش بەرز دەبێتەوە کە لە ژیاندا خاوەن پەیامێکی بەرز بێت و بزانێ بۆچی دەژی و بەرەو کوێ دەچێ و خاوەن ویستی خۆی بێت. گەر ناتوانی بەتەواوەتی فەرمانی خوای گەورە سەبارەت بە جل وبەرگت بەجێبهێنی، بەلای کەمەوە پێش دەرچوونت لەماڵەوە پۆشاکێك دەبەر مەکە کە ببێ بە سەرچاوەی جووڵاندنی ئارەزووی جنسیی گەنجان. ئەو کارەش گەر لەپێناوی رەزامەندیی خوا بکرێ، دڵنیابە بەدەیان قات پاداشتەکەی وەردەگری، خوای گەورە ئەرکی ئەوانەی لەبیر ناچێ و فەرامۆش ناکات کە لەپێناوی ئەودا ئیش دەکەن.

ئەی ئافرەتان! دۆست و دوژمنی خۆتان بناسن، گوێ لەو قسە تاڵە ژەهراوییانە مەگرن کە بە هەنگوین داپۆشراون؛ گەردنی ناسکی مرۆڤایەتیتان بە گوریسی ئاوریشمی قسەی درۆی بەناو رزگاریخوازانی ئافرەتان مەخنکێنن؛ ئەوانە دەیانەوێت لە هەموو کون وقوژبنێکدا، لە هەموو جادە و دەزگایەکدا پیشانگای لەشی ئافرەت ببینن. برۆن بە ئارەزووی خۆتان ئیشی شیاو بە پێکهاتەتان بکەن، ئافرەت توانای هەموو جۆرە ئیشێکی هەیە، بەڵام چوارچێوەو رواڵەتتان ریزگرتن لە مرۆڤایەتی بنوێنێ. خوا دژی ئازاردانی ئافرەتە، لەگەڵ هەموو ئەو مافانەیە کە لەگەڵ سروشتە مرۆڤانەکەیاندا دەگونجێ، ئەوانەی ئازار بە ئافرەت دەگەیێنن، ئەوانە لە دەرەوەی چوارچێوەی خواناسیی هەڵسوکەوت دەکەن، هیچ هۆیەك لە ئارادا نییە بۆ سەرپێچیکردنت لە فەرمانی خوا، تۆ وەك پیاو پێویستت بە سەربەرزی هەیە، نزیکبوونەوە لە پەروەردگارت، نزیکبوونەوەیە لە سەرچاوەی سەربەرزی و پتەوکردنی بنەماکانی مرۆڤایەتیت. تۆ پێویستیت بە ناسینی خۆتە، تا خوای خۆت نەناسی و هۆی هاتننت بۆ سەرزەوی نەزانی، ناتوانی خۆت بناسی. تا توانای بڕیار دانت هەیە بۆ بەرژەوەندی هەمیشەیی داهاتوت بەکاری بێنە، کاتێك مردن هات مۆڵەتت پێنادرێ بۆ بڕیاردان، تۆ قوتابی بووی و دەزانی کاتێك لە هۆڵی تاقیکردنەوە دەرچوویت و

وەڵام دانەوەت تەسلیم کرد و چاوت بە وەڵامی پرسیارەکان کەوت، چیتر گەڕانەوەت نییە بۆ ناو هۆڵی تاقیکردنەوەکە!

ئەی ئافرەتان و ژنانی سەر رووی ئەم زەوییە! دەبێ لە دۆزەخ بترسن، سەیری ئاسمان بکەن چەندین ئەستێرەی تێدایە، هەر ئەستێرەیەك نیمچە دۆزەخێکە، بەڵام دۆزەخی ئامادەکراو بۆ یاخیبوان لە خوای خۆیان لەو دۆزەخە بچووکانە گەورەترو گەرمترو بەگڕترە. دوژمنانی ڕێگای خواو دوژمنانی بەرژەوەندی ئێوە ئەم جۆرە ئاگاداریانەیان پێ ناخۆشە، دەڵێن بەدۆزەخ مەمانترسێنن، هەرچەندە لەترسی ڤایرۆسێك وەك ڤایرۆسی ئینفلەوەنزای باڵندە کە بچووکترین دروستکراوی خوایەو بەچاو نابینرێت و لەهەموو جیهاندا هەزار کەسی زیاتر نەکوشتوە، کەچی ئەو جیهانەی شێواندووەو خەڵکی ترساندوەو ملیۆنەها دۆلاری بە مرۆڤ سەرف کردووەو ناچاری کردووە بەرامبەر مریشك و قاز دەم و لووت و دەست بشارێتەوە؛ پیاو پێش ئافرەت خۆی پۆشیوە نەوەك ڤایرۆسێك بازبداتە ناو دەم ولووتی!! هیچ رەخنەیەکیان بەرامبەر ئەم ترساندن و تۆقاندنە نییە، بەلام بەلایانەوە سەیرە گەر لە توورەیی خوا بترسینرێن کە ئەنجامەکەی دۆزەخە، ئەو دۆزەخەی کە لەناویدا ئاواتی مردن دەخوازن بەڵام دەستیان ناکەوێ.

ئەی ئافرەتان! ئەی دایکان وخوشکان وکچان! من بۆیە زۆر

لەگەڵ ئێوە دەدوێم، چونکە ئێوە ناوکی چاکسازی کۆمەڵگاو نەتەوەن. لەبەر بەرژەوەندی خۆتان، لەپێناوی ڕەزامەندی خوا، لە پێناوی گەل و نەتەوەو وڵاتتان ڕێگای چاکسازی گشتیی دڵ و دەروونی خەڵکی بگرنە بەر.

دەبێ بە دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان و سەرکردەکان بڵێم: گەل و هاوڵاتیان بوونەتە ئەمانەت لەبەر دەستان، زۆریان لێ مەکەن ڕێگای دوور لەخوا وەربگرن، بەڵکو ڕێی ئازادی ڕاستەقینەیان بۆ خۆش بکەن. بڕوا بکەن دەسەڵاتتان بەوە بەردەوام دەبێت، چونکە خوا لەپشتێتی. ڕێ مەدەن بەوانەی هەوڵ دەدەن ئازادی خەڵکی زەوت دەکەن، گوێ لە قسەکانیان مەگرن، چاو لە ڕاپۆرتەکانیان بنووقێنن، چونکە ئەوانە دەیانەوێت پشت شکاندنی خەڵکی بکەنە پردێك بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان کە بێگومان ئەنجامەکەشی پەلە کردنە لە ڕووخاندنی دام و دەزگا و عەرشی دەسەڵات و پێشەوایەتیتان. ئەو مشەخۆرانە لەوانەیە کەمێك دڵسوزتان بن، بەڵام بەرژەوەندیی تەسکی خۆیان زۆر لا گرنگترە لە متمانەی میللەت پێتان، هەمیشە چاوتان لە هەڵسوکەوت و کارەکانیان لەناو خەڵکدا بێت، چاودێریی داهاتی داراییان و بەکارهێنانی دەسەڵاتیان بکەن . پارەوپوولی میللەت مەخەنە گیرفانی ئەو مشەخۆرانە، داهاتی وڵات سەرف بکەن بۆ هەژاران و بێ دەرامەتەکان و بۆ خزمەتگوزاریی میللەت. کەسی شیاو لە جێی شیاودا دابنێن، دوور

لە خزمایەتی و حیزبایەتی، خـوای پـەروەردگاریش بـە پایـەی داد دەوڵەت رادەگرێ ودەیهێڵێتەوە.

بە ڕۆڵەکان دەڵێم: لەژێر پێی ڕەزامەندی دایك و باوکتاندا بـن، دڵیان بە چی خۆشبێت ئەوە بکەن، بەمەرجێك ناڕەزامەنـدی خـوای تێدا نەبێت، یەکەمین خوای مەزن و ئینجا ئەوان، ئـەوان بـەخێویان کردوون بەڵام خوا دروستی کردوون. دڵتان خورپەی ناڕەزامەندی بـۆ باوك و دایکتانی لێ نەیەت، چۆن دەبن بـۆ دایـك و باوکتـان ئـەوا رۆڵەی داهاتووتـان وەك ئێـوە دەبـن، بۆیـە بەرهـەمی داهاتووتـان بەدەست ئێوەیە. نوێژەکانتان مەفەوتێنن، نوێـژەکانتان وەك فـایلی قوتابخانەتانە، قوتابییەك فایلی نەبێت، یان ناونووس نەکرابێت، بـە قوتابیی ئەو قوتابخانەیە ناژمێردرێت، با هەزارتاقیکردنەوە بکات و ملیۆنەها نمرەی هەبێت، تا نوێژ نەکەیت ناوت لەناو بەندەکانی خوا نانووسرێ، دەبێت رۆژی پێنج جـار بەندایـەتی بـۆ خـوا پێـشکەش بکەیت، پێنج جار بەدیداری پەروەردگارت شاد بیت.

دەبێ بە دایکان و باوکان بڵێم: منداڵەکانتان بکەن بە هـاوڕێی دڵسۆزی خۆتان، دادپەروەری لە نێوانیاندا پیادەبکەن، کچ و کوڕ لە مافەکاندا جیاوازیان نییـە، هەرچـەندە لـە ئەرکەکانـشدا کـەمێك جیاوازیان هەبێت، پەروەردەیان بکەن لەسـەر خۆشەویستی خوا و یارانی خوا ولەسـەر خۆشەویـستی وڵات، گـەورەیان بکـەن لەسـەر راستگۆیی و پاك وخاوێنیی جەستەو دەروون، شەڕ وهاوار و جنێو و

درۆ مەكەن لە بەردەمیان.

خێزان بەردی بناغەی كۆمەڵەو بە تەبایی و خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ئەو خێزانە بەردەوام دەبێ و دەبێتە فاكتەری بنیاتنانی كۆمەڵ. ئەی پیاوان! دڵی هاوسەرەكانتان رابگرن، واز لە توورەیی و دەست وەشاندن و رووگرژی بێنن، زەردەخەنە لەناو خێزاندا بڵاوبكەنەوە، گیانی یارمەتی بۆ هاوسەرەكانتان هەبێ، بەتایبەتی هاوسەری فەرمانبەر، چونكە ئەوان ئەركیان دوو قاتە، لە چیای بەرزی پیاوەتیتان كەمێك وەرنە خوارەوەو وشەی جوان و نەرمیان پێشكەش كەن، بڕوا بكەن ئەو جۆرە رەفتارانە لە پیاوەتیتان كەم ناكاتەوە، بەڵكو بەپێچەوانەوە بەرزی دەكاتەوە، بەتایبەتی گەر لە پێناوی خوا بێ، تكاتان لێ دەكەم واز لە وشە نابەجێی وەك: ژن بەسەرتا دەهێنم، بە تەلاقم و... بێنن. ئەم وشانە بە وشەی جوانتر بگۆڕنەوەو خۆتان لەسەر هەڵبژاردنی وشەی جوان رابێنن، ئەوەش لە پێناوی رەزامەندی خوابێت. ئافرەتانیش رۆڵێكی گرنگیان هەیە لە بڵاوكردنەوەی خۆشی و شادی لەناو خێزاندا. هیچ رەوا نییە ئافرەت بۆ بێگانە بە جوانترین شێواز خۆی پیشان دەدات و كە دێتە ماڵەوە شێوەی خۆی دەگۆڕێت، لە جل و بەرگ و قسە. ئەی پیاوان و ژنان! لە پێناو بەردەوامی خێزان و داهاتووی منداڵەكانتان، تكایە هەر یەك و رۆڵی خۆی بزانێ و جێ بەجێی بكات.

دەبێ بەزانایان بڵێم: زانست هەرگیز دژی خواناسین نییە، هەتا

پانتایی زانیارییەکانتان فراوانتر بێ، دەبێ لە خوا نزیکتر بن، زانایانی بیانی ئەو راستیە دووپات دەکەنەوە، تێگەیشتنی هەر ئالۆزییەك لە پێکهاتەی گەردوون، یان ناو خانەکانی لەشتان بەلگەیەك زیاد دەکات بۆ خاوەن باوەڕان کە ویستێکی خوایی هەیە لە پشت دروستکردنی ئەم بوونەوەرەدا. تا مەزنایەتی پەروەردگار بە هۆی دۆزینەوەی نهێنییەکانی گەردوون و ناو خانەکان ئاشکراتر بکەن، دەبێ شانازی بە خۆتان بکەن، چونکە ئێوە دروستکراوی خوایەکی مەزنن. ئەگەر تێڕوانینی دەستکەوتە زانستییەکان بکەن دەبینن زۆربەیان بەشێوەیەکی لاوەکی هاتوونەتە دی، هەرچەندە هەوڵ دراوە بۆ دۆزینەوەی شتی تر (بۆ نموونە دۆزینەوەی پەنسیلین)، ئەوەش ئەوە دەگەێنێ کە دەستێکی نادیار لەپشتتاندا هەیە کە خاوەنی ئەم بوونەوەرەیە. لەبەر دەستکەوتە زانستییەکانتان لە خۆ بایی مەبن. ئێوە کە ئەنجامێکی زانستی بەدی دێنن، ئەنجامەکانتان رێژەییە؛ بۆ نموونە گەر توێژینەوە لەسەر جۆرە درەختێك بکەن، تەنیا سەد یاخود هەزار درەخت وەردەگرن، بەلام کە خوای گەورە راستییەکتان پێ دەلێت سەبارەت بەو درەختە، ئەوا هەموو درەختەکانی سەر زەوی گەلا گەلا وەردەگرێ، ئەوەیە جیاوازی لە نێوان زانیاری ئێوە و زانیاری خوای گەورە. هەندێ لەزانایانمان کە بەرهەمێکی زانستییان دەست دەکەوێ، هەستێکی ناڕەوا بە

دەروونە نەخۆشەکەیان دێت کە نزیکبوونەتەوە لە کاری خوا، بۆ نموونە دروستکردنی کۆمپیوتەر بەراورد دەکەن لەگەڵ مێشکی ئادەمیزاد، ئەوەشیان لەبیر چووە کە بەرهەمی دەستی ئادەمیزاد ئاسن و کانزای بێ گیانە، بەڵام بەرهەمی دەستی خوای گەورە گۆشت و گیانی زیندووە؛ ئەوە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە خوای گەورە یارمەتیدەری زانایانە بۆ دەستکەوتە زانستیەکەیان.

با مامۆستای ئاینیش لە برابچووکیان تەنیا دوو ئامۆژگاری وەربگرن. یەکەم ئامۆژگاری ئەوەیە: با کردارە چاکەکانتان پێش وشەکانتان کەوێت، بەوە کاریگەرتر دەبێت. دووەم ئامۆژگاریم ئەوەیە: وتارە ئاینیەکانتان نۆژەن بکەنەوە، ئاینی خوا بۆ هەموو سەردەمێك هاتووە، بەڵام دەبێ بە زمانی ئەم سەردەمەی تێدا دەژین باسبکرێت ، نەك بە زمانی سەردەمەکانی رابوردوو.

وتەم بۆ هونەرمەندان و رۆشنبیرانیش ئەمەیە: مەخابن ئەو هەستە هونەرییە بۆ ئامانجێکی تەسك و کورت و نەشیاو بەو بەهرە خواییە دەخەنە گەڕ! با ئاوازەکانتان لەگەڵ وشە بەهادارەکانتاندا بگونجێ، وشەی بەرزکردنەوەی بنەماکانی مرۆڤایەتی رەسەن، نەك نوقم کردنی بەرەو قووڵایی قوڕ و چڵپاوی ژیانی ئاژەڵیی بێ ئاوات و ئامانج تەنیا سەما کردن وەك بەرخی سەربڕاو یان وەك نێچیری راکردوو لەدەست راوکەرەکەی. وشەی جوان دابڕێژن، ئاوازی جوانی

بۆ دابنێن کە هەستی ئادەمیزادی پێ بجووڵێنێ و خۆشەویستی تێدا بچێنن تاکوو روو بکاتە خوای پەروەردگاری خۆی، ئاوڕبداتەوە لە دەوروپشتی، لە برادەری بەوەفا و خوشك و برا و دایك و باوك و کۆمەڵگا و وڵاتی. نابێ گۆڕەپانی بەرینی هونەر تەسك بکرێتەوە و تەنیا تایبەت بێ بە وەسفی باڵا و جوانی ئافرەت. ئێوە هونەرمەندن، ئێوە بازرگان نین!! بەدوای داواکاری جادەو بازاڕدا مەگەڕێن، بابەتە بەهادارە رەسەنەکە دابڕێژن و بیخەنە ناو بازاڕی هەست و هۆشی خەڵك، دەستپێشخەر بن لە بەرزکردنەوەی ئاستی هەست کردن و بیرکردنەوە لەناو توێژەکانی کۆمەڵدا، ئەوەش کاکڵەی راستەقینەی ئیبداعی هونەرییە. ئەی هونەرمەندان، ئەی نووسەران، ئەی دەرهێنەران و ئەکتەران! ئەرکێکی مێژوویتان لە ئەستۆدایە. شانۆگەری و تەمسیل و فلیمی بە ئامانج بەرهەم بێنن، خوو و رەوشتی بەرزی تێدا بنوێنن. ئەوکارەتان لە هەزارەها کتێب و ئامۆژگاری کاریگەرترە. بن بە فاکتەری بنیاتنان، نەك تێکدان. ئەی نووسەران! مێژوو تێك مەدەن و راستیەکانی لەبەرچاوی خەڵکدا مەشێوێنن، شتی ناڕاستەقینە مەنووسن بۆ ناوبانگ دەرکردن، یان دەستکەوتنی پارەو پوول و نامەی زانستی. قەڵەمی خۆتان بە نرخێکی کەم مەفرۆشن، سەیری کڕیار و نرخ بکەن، وابزانم هیچ کڕیارێك لە خوا مەزنتر و دەوڵەمەندتر و بەدەسەڵاتر نییە، هیچ نرخێکیش لە بەهەشت و نزیکبوونەوە لە خۆشەویستیی خوا

بەرزتر نییە.

وتەم بۆ هەندێ پزیشك ئەوەیە لە مامەڵکردن لەگەڵ خەڵکدا دوورِوو مەبن، رووخۆش لە عیادەی تایبەت و رووگرژ لە نەخۆشخانەو عیادەی گشتی، ورد بن لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان و رووبەری زانیارییە پزیشکییەکەتان فراوانتربکەن، هەندێ لەکاتتان بدەنە پشووی جەستەو دەروونتان، لەگەڵ کێشەکانی خێزان و دەوروپشتاندا بژین. پشکنین و دەرمانی زیاد و ناپێویست بۆ خەڵکی مەنووسن . جار بەجار بە خۆڕایی تیماری خەڵکی بێدەرامەت بکەن و دڵنیا بن کە ئەوە بەخۆڕایی نابێت، بەڵکو خۆشیەکی دەروونی پێتان دەبەخشێ، بەتایبەتی گەر لە پێناوی رەزامەندی خوا بێت.

دەبێ بە کاسبکاران و بازرگانان بڵێم: تکاتان لێ دەکەم پارووی حەرام مەخەنە دەمی هاوسەرو منداڵەکانتان، دڵنیا بن هەر پاروویەکی حەرام تێکدەری تەندروستی ئادەمیزادە، زەرەری لە قازانجی زیاترە، باشی و خراپی بابەتەکانتان ئاشکرابکەن، لەبەر قازانجێکی کاتی ماڵی خۆتان بەدەستی خۆتان کاول مەکەن، ئەگەر بتانەوێ قازانجی زیاترتان دەستکەوێ دەستی یارمەتی بۆ هەژاران درێژ بکەن.

بە چینی مامۆستایان دەڵێم: پیرۆزترین پیشەتان هەڵبژاردووە، لەگەڵ زانست خوو و رەوشتی مرۆڤایەتی فێری قوتابیانتان بکەن،

ئاستی ڕەوشتی و زانستی نەوەی داهاتوومان کەوتۆتە سەر ئەستۆی ئێوە. لە وانەوتنەوە دڵسۆز بن، مەهێڵن قوتابیان و خوێندکارانی پۆلەکانتان پێویستیان بە وانەی تایبەت هەبێ، قوتابیان و خوێندکاران دامەپڵۆسێنن، دڵتان لەگەڵیاندا فراوان بێ، بە قسەی خۆش و چوونە ناو کێشە تایبەتیەکانیان ڕێزلێنانتان بسەپێنن، گرنگی بدەنە جل و بەرگتان، قوتابی وەرگری باش دەبێت گەر ڕێز و خۆشەویستی بۆ مامۆستاکەی هەبێت.

ئامۆژگاریم ئاڕاستەی ئەوانە دەکەم کە لە ژیانیاندا کارەساتی گەورەیان تووش هاتووە، ئەوانەی کە مردن برادەر و برا و خوشک و باوك و دایك یان کچ و کوڕیانی لێ فڕاندوون، هەندێکتان لەوانەیە لە یەك کاتدا زیاتر لە خۆشەویستێکی لەدەست دابێ، یان شێوەی مردنیان ئاسایی نەبووبێت، یان مردنەکە کێشەی تری بەدواوە بووبێت وەك هەتیو بەخێوکردن، یان کەم ئەندامی، یان ماڵ کاولبوون؛ ئەو ڕووداوانە کارەساتی کوشندە نین گەر بزانین چۆن مامەڵەی باشیان لەگەڵدا بکەین . دەبێ یەکەم جار بزانی کە خوای پەروەردگاری ئەم گەردوونە لەم ڕووداوانە بێ ئاگا نییە، دووهەمیش: ستەمکردن بە هەرشێوەیەك بێ دوورە لە کاری خوای گەورەو ئەو ستەمکاریی لە ئێمەی قەدەغەکردووە، ئیتر چۆن خۆی دەیکات؟ توانای بێ سنووری ئەو پێویستی بە ستەمکاری نییە،

یەکێک ستەم دەکا، کە پێویستی پێی بێت، بەڵام خوا دەوڵەمەندەو پێویستی بەکەس نییە. راستە ستەمکارانیش دەوڵەمەندن، بەڵام ئەوان پێویستیان بە بەردەوامبوونی دەسەڵاتیانە، بۆیە ستەمکاری دەکەن دژی ئەوانەی لێیان دەترسن دەسەڵاتیان لیٚ بستێنن. سێیەم: دەبیٚ ئەوەتان لەبیر نەچیٚ کە دونیا جێی پاداشتدانەوە نییە و کۆتایی چیرۆکەکە نییە، دونیا مانەوەیەکی کاتییە بۆ کار کردن، شوێنی پاداشتدانەوە دوای خاڵی گواستنەوە(واتە مردن) دەبێت، ئەو کاتە کاتی لێکۆڵینەوەی سەرجەم ئیشەکانی دونیات لەگەڵ دەکرێت.

بەرامبەر ئەو کارەساتانە ئەم بڕیارە راستەوخۆیانەت لە بەردەمدایە:

١- باوەڕو متمانەیی بەخواوەند و بە دادپەروەرییەکەی لە ئازارو وکارەساتەکان بە گەورەتر بزانی، ئەوەش دەبێتە هۆی ئۆقرەگریی و درێژەدان بە ژیانت. ئەو بڕیارە دونیات لە دەست نادا و لەو دونیاش لەلایەن خواوە پاداشتێکی بیٚ وێنەت پیٚ دەبەخشریٚ.

٢- باوەڕت بە خوا لاوازدەبێت و تووشی رووخاندنی دڵ و دەروون دەبی و ژیانت بۆ ماوەیەکی زۆر یان کەم دەوەستێت و پاداشتێکت پیٚنادریٚ، هەرچەندە سزاش نادرێیت.

٣- لە ئەنجامی ئەو کارەساتانە لەرێی خوا پاشگەز دەبی و تووشی بیٚ ئومێدی دەبی و لەوانەشە بڕیار بدەی کۆتایی بەو ژیانە بێنی، ئەو کاتە دونیا و پاش دونیات لەدەست دەچیٚ، چونکە

یەکێك خوا پشتی بەردات هەرگیز کەس پشتی ناگرێت.

کەواتە ئەم رووداوانە گەر بەپێی ئەو زانیارییانەی سەرەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەی و رەزامەندی بنوێنی و هەوڵبدەی هەنگاو بنێی بۆ تیمارکردنی برین و سارێژکردنی ئازار و چارەسەرکردنی کێشەکان، ئەو کاتە پاداشتەکانی خوا وەردەگریت. یەکەم پاداشت: بەهەشتی بەرینە؛ دووەم: یارمەتیت دەدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانت؛ سێیەم: ئارامییەك دەخاتە ناو دڵ و دەروونت کە دەبێتە مایەی بەردەوامی و ئارامی ژیانت. گەر ئەم قسانەت بە دڵ نەبێ، ئەوا گیر و گرفت وکارەساتەکان هەر روو دەدەن، بەڵام بێگومانیش هیچ کەسێك چارەسەری لەوە باشتری پێ نییە بۆ ئەو کێشانەت.

بەوانە کە خۆیان و خەڵکی بێ تاوان دەکەنە قوربانی، بە مەبەستی رزگارکردنی وڵات دەڵێم: متمانە بە هەموو کەسێك مەکەن و مەیکەنە سەرچاوەی بڕیار وەرگرتن، هەتا خوو و رەوشتی هەڵنەسەنگێنن و بەدوو پێوانە پێوانەیان نەکەن- ئەو دوو پێوانەیە دوو سەرچاوە سەرەکییەکەی ئاینی خوان کە بریتین لە کتێبی خوا و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ - ئینجا ئەگەر وێنەکە لاتان هەر لێڵ بوو دڵی خۆتان بکەنە پێوەر، دڵ ئەگەر خاوێن بێ لە غەیری خوا راستییەکان بەئاسانی دەبینێت. دوا هەنگاو بۆ هەڵسەنگاندن رووکردنی راستەوخۆیە بەرەو خوا و دەست بەرزکردنەوەو داواکردنی یارمەتییە بۆ ناسینی بەرامبەرەکانتان.

ئەگەر ئەنجامی ئەمانە هەمووی ئەو کەسەیان پەسەند کرد، ئەو کاتە بیکەن بە مامۆستا و ڕێنماییەکانی وەربگرن. دڵنیام هەرگیز ئەو جۆرە مامۆستا بەڕێزانە ڕێی ئەوەتان پێ نادەن بە ناحەق خوێنی ئادەمیزادی بێ گوناه بڕێژن، خوا و پێغەمبەری خواش بەوە ڕازی نابن. ڕزگارکردنی مەککە لە دەست کافرەکان ئاواتێکی گرنگی پێغەمبەر بوو ﷺ ، ئەو کاتەی لە مەدینە بوو خوای گەورە پێی فەرموو: لەبەر ئەوەی مەککە هێشتا هەندێ باوەڕدارانی تێدایە، ئێمە جارێ نامانەوێ هێرش بەرنە سەر مەککە، چونکە لەوانەیە لە ڕێگادا بێ ئەوەی ئێوەش بزانن، خوێنی ئەو باوەڕدارانەش بە پیاو و بە ژنەوە بڕێژرێ، گەر کافرەکان جوودابوونایە لە باوەڕداران، ئەو کاتە زەمینە خۆش دەبوو بۆ هێرش بردنە سەر کافرەکان بێ ئەوەی زیان بە باوەڕداران بکەوێت. ئەوە لە سوورەتی (الفتح) ئایەتی٢٥ دا هاتووە. ئەمە لەو کاتەی کە شەڕ بە شمشێر و ڕم بوو نەك بە چەکی نوێ، کە وەك دەبینین، گەر یەك دوژمن بکوژێ، بە دەیان خەڵکی بێ گوناه دەفەوتێنێ وماڵیان کاول دەکات. ئەم ئیشە وەك هەڵەیەك نییە لە نوێژدا بە سوجدەی سەهوو داپۆشرێت، ئەوە خوێنی مرۆڤە. ئێمە ئەگەر لە هەموو ئاڵوگۆڕێکدا بابەت و نرخ بقرسێنین و بەوردی هاوسەنگیان بکەین، هەرگیز دووچاری زیان نابین. ڕشتنی خوێنی ئادەمیزادێك بەبێ هۆ لە تیاچوونی سەرجەم دونیا لای پەروەردگار گرانترە.

ئەوانەی سەرەوە بانگەوازی تایبەتی بوون، بەڵام دەبێ شاخ و داخ و دۆڵ و بیابان دەنگم بدەنەوە، بانگەوازی گشتیم بگەیەنن بە خەڵکی:

ئەی ئەوانەی کە بەدڵ و بەگیان داواکاری بەهەشتن! کاتی کڕینی بەهەشت و فرۆشتنی دۆزەخ ئەمڕۆیە نەك سبەینێ، سبەینێ کە فریشتەی مردن لەلایەن خواتانەوە دەبێتە میوانتان و گیانتان لە لەشتان جیادەکاتەوە، چونکە ئەو لەشە رۆڵی نامێنێ و لەگەڵ داهاتووت ناگونجێت، گیانیشتان دەگەڕێنێتەوە بۆ لای قۆناغی پەروەردگارتان بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ ببینێ، ئەو کاتە کڕین و فرۆشتن کۆتایی پێ دێت و پەرتووکی دەستکەوتەکانی چاکەو خراپەتان دادەخرێت، چونکە هەموو شتێك بە راستەقینە دەبینێ و لە سنووری تاقیکردنەوە دەردەچێت. ئەو کاتە ئاواتەخواز دەبن بگەڕێنەوە بۆ دونیا بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوتی زیاترو ئەوەی کەمتەرخەمی کردبوو پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ، لەکاتێکدا پەشیمانی بێ هوودەیە و سوودی نابێ.

ئەی ستەمکاران! سبەینێ دەمرن و ستەم لێکراوان بە پێڵاوەکانییانەوە دەکەونە سەر خۆڵی گۆڕەکانتان، برا و نەوەکانتان خۆڵی گۆڕەکانتان دەکوتنەوەو ئاوڕشێنی دەکەن تا بە پەلە بگەڕێنەوە بۆ دابەشکردنی میرات و پارە و پوولەکانتان و لەسەر عەرشی دەسەڵاتتان دانیشن.

ڕوو ئەکەمە ئەوانەی پشت لە خوایان کردووە وهەر خەریکی زەرەرگەیاندن بە خەڵك وئاژاوەنانەوە وخۆشکردنی ئاگری دووبەرەکی نێوان خەڵکن وئامرازەکانی ڕاگەیاندن وهونەر و... کردووە بە سووتەمەنی ئەو ئاگرو ئاژاوەنانەوە، بەوانە دەڵێم : ئێوە کەفی دەریان وگەندی کۆمەڵگان، هەر ئەوەندە شەپۆلی فیکری و دەروونی و زانستی ڕاستەقینە جووڵەی تێکەوێ وپسپۆری تایبەتی لێ هەڵکەوێ، ئەو کاتە کارە ڕەشەکانتان ئاشکرادەبێ وبەر نەفرەتی مێژوو دەکەون، بێ گومان نە زەوی دەگری بەسەرتان و نە ئاسمان. خوای پەروەردگار دەستی لێبووردنی بۆ بەندەکانی هەمیشە درێژکراونەتەوە، بۆیە هێشتا بواری پەشیمانیتان لەو کارە خراپانە ماوە و دەتوانن نەخۆشیە دەروونیەکانتان تیمار بکەن ودڵنیا بن لە دەرەوەی دەرمانخانەی خواناسی چارەسەرتان دەست ناکەوێ.

ئەی ئەوانەی هەموو شتێکتان فرۆشت بە هیچ و هیچتان کڕی بە هەموو شت! بەهەشت و نزیکی خواتان فرۆشت بە دۆزەخ و دووری لە خواو دۆزەختان کڕی بە بەهەشت، بازرگانییەکەتان کۆتایی پێ هات، چونکە سەرمایەتان نەما.

ئەی دانیشتووانی مزگەوتەکان! دانیشتنتان لەو جێگا پیرۆزە پێویستی بە دڵ خاوێن کردنەوەیە لە یادی غەیری خوا؛ دڵتان پڕکەن لە خۆشەویستی خوا ئینجا نوێژ دابەستن.

ئەی ئەو کەسەی بە زمان ناوی خوا دەبەی! ناوی خوا مەبە و دڵت لای یەکێکی تر بێ. گەر بزانی خوای گەورە چاوی لە ناو دڵتە ئەو کارەت نەدەکرد.

ئەی لەش ساغان! ئەی قسەزانان! ئەی بێکاران! گەر دڵتان ئاگای لە قازانجی خواناسان بێ خەفەتبار دەبن؛ ئاگادار بن.

ئەی دیلی ئارەزووەکانی نەفس! ئەی بەندەی خەڵك! ئەی نەزان بە ئەنجامی داهاتوو، نەناس بە خۆی و بەخوای خۆی و بە خەڵکی و بە دەوروپشتی! دۆست و دوژمنی خۆت بناسە، خوای تاك و تەنیا دۆستی یەکەمتە، ئینجا لیستی دۆستەکانی ترت لەو وەربگرە!!

ئەی پەروەردەی تەمەڵی و راکردن بەدوای ئارەزووەکانی نەفس و هەوەس! قازانج لەو دەڤەرەدا نییە، قازانج لە دەڤەری ناسینی خوا و شوێن کەوتنی رەزامەندییەتی. دوورکەوە لەو شتانەی پێی ناخۆشە تا ئەو شتانەی پێت خۆشە بۆت بهێنێتە دی.

ئەی دەست بەتاڵ ! بەیادکردنێکی ناوی خوا درەختێك بۆ خۆت لەناو بەهەشت دەچێنی، ساتێك رووکردن بەرەو بارەگای خوا تیشکێکی رووناکی پێت ئەبەخشێ سوودی لێ وەردەگری لە پەڕینەوە بەسەر دۆزەخ بەرەو بەهەشتی خوا، سەرچاوەی رووناکی سبەینێت کردارە چاکەکانی ئەمڕۆتە، کۆشکی بەهەشتت بە درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ لێقەوماوان برازێنەرەوە، چۆن دڵت

دێ بەتێرێتی بخەوی کەچی دراوسییەکت یان هاولاتییەکت نانی نەبێ بیخوات، چۆن دەبیتە دراوسێی پێغەمبەران کەچی لەناو جێی گەرمو گوڕدا دەخەویت ئاگاشت لێیە هاولاتیەکت لە سەرما وا دەلەرزێت، یان لەژێر فێنکایی ساردکەرەوە پالدەکەویت لەو کاتەی دراوسیەکەت ئارەق بەلێشاو دەرژێنێت،ئەو خوایەی لە ئافرەتێکی لەشی فرۆش خۆشبوو لەبەر ئەوەی ئاوێکی کرد بە قورگی سەگێکی تینوودا، ئەو جۆرە کردارانە بە وردی هەڵدەسەنگێنێ.

ئەی سەرقاڵ بە هیچ! سبەینێ دەستکەوتە هیچ و پووچەکانی دونیات دەتوێنەوە و دەڕووخێن و تەنیا خوا و سزا و پاداشتی لەبەردەمتدا دەبینی، ئەو کاتەش بیانووی ئامادەکراوت چییە؟

ئەی ئەو کەسەی گاڵتەت بە گەورەترین راستییەکانی بوونەوەر دەکرد، کە بوونی سەرچاوەی هەموو بوونەوەرانە، گاڵتەت بە تاکە راستییەکی ژیانت دەهات کە مردنە و واتدەزانی خاڵی کۆتاییە، گەر خاڵی گواستنەوەت بۆ ژیانی نەمری بێ چی دەکەیت؟ گەر بەرامبەر خوا بوەستی هەست بە چی دەکەی؟ ئەوە هەڵەیەك نییە بەرامبەر بە بەڕێوەبەر یان برادەر، ئەوە هەڵەیەکی چارەنووسسازە بەرامبەر خوای خاوەنی هەموو بوونەوەران. هەندێ جار ناوی زەلامێك بەخراپ دەبەیت و دڵنیاشی پێی ناگات، ئەگەر پێشی گەیشت ئەوا بەرامبەری شەرمەزار دەبیت، ئەی ئەگەر بوونی خوات فەرامۆش کرد، ئەو خوایەی کە بەشەو و بە رۆژ پێداویستەکانتی

بەدرێژایی تەمەنت بۆ دابین کردووی و هاتیتە بەردەم بارەگاکەی بە چی هەڵەکانت پینە دەکەی؟ روو لەکوێ دەکەی؟ بۆ هەر لایەك ئاوڕ بدەیەوە ئەو لەبەرامبەر خۆتدا دەبینی.

ئەی ئەو کەسەی سیفەتێك بۆ خوا دادەنێی، کە لە راستییەوە دوورە! بەدوای راستیی ئەو سیفەتە بگەڕێ و لێی پەشیمان ببەوەو گوێ مەدە بە رەزامەندیی دۆستان؛ رەزامەندی خوا بەسوودترە! تووڕەیی دوژمنان فەرامۆش بکە؛ تووڕەیی خوا ترسناکترە.

نەناسینی خوا وات لێ دەکا متمانە بە غەیری ئەو بکەی. پشت بەستن بە خوا دەوڵەمەندییە، پشتبەستن بە غەیری ئەو ئاکامەکەی هەژاری و ریسواییە.

ئەی چالاك و گورج و گۆڵ لە کاروباری دونیا، دەست بەتاڵ و تەمەڵ لە کاروباری رۆژی دوایی! ئەگەر مێشکت لە کار بوایەو کەمێك لە بازرگانی و کڕین و فرۆشتنت دەزانی، بۆت دەردەکەوت کە لەسەر رێی زەرەرمەندیی گشتیی هەنگاوی کوێرانە دەنێیت، بۆ ساتێك بوەستە وسەرنج بدە خۆت و دەوروبەرت، بڕوانە خولی ژیان و مردن، هەوڵدان و چارەنووس و پێداویستییە گرنگەکانی ژیان، وتەی خوا و قسەی ئادەمیزاد، بەڵێنی خوا و بەڵێنی غەیری خوا، ئاواتەکان و دەسکەوتی رابوردووت، دەسکەوتەکانی لەش و دەروون. جار بە جار لە کاروانی ژیانتدا، ئەو چاوپیاخشانەوەیە بکە.

ئەی سەرخۆش بە مەیی دونیا و ئارەزووەکانی نەفس! بەم زوانە لە ناو گۆڕەکەتدا هۆشت دێتەوە بەرخۆت!خەڵکی نووستوون،کە دەمرن خەبەریان دەبێتەوە.

ئەی مرۆڤ ! خۆزگە دروست نەبوویتایە، وەکو دروستیشکرای بتزانیبایە بۆ دروستکراوی!

ئەی نوستوو! لە خەو هەڵسە، چاوت بکەوەو سەیری بەردەستت کە، ئەوا لەشکری ئەشکەنجەدەران هاتن و تەنیا میهرەبانیی خوا بۆتە بەربەست لەنێوان تۆ و ئەواندا، میهرەبانیی خۆی مۆڵەتت بۆ درێژ دەکاتەوە بەهیوای بەئاگابوونەوەت. لە قوتابخانە لە هەر وانەیەك پێنج یان شەش تاقیکردنەوەت بۆ دەکرێ، لە رۆژێکدا خوای گەورە رووبەڕووی سەدان تاقیکردنەوەت دەکاتەوە، بەهیوای دەرچوونت لەیەك تاقیکردنەوەدا، نمرەی بەرز بێنیت خراپەکانت بۆ دەسڕێتەوە، هەر نمرەیەك دە تا حەوت سەد جار زیادی دەکات، بەڵام نمرە خراپەکانت بە یەك جار دەژمێرێت، دەرچوونی تۆ مەبەستێتی، بەڵام کۆسپە گەورەکە ئەوەیە خۆت ناتەوێ دەرچیت، دەرچوونی دونیا زیادبوونی ئەرکە، بەڵام دەرچوونی قوتابخانەی خۆشەویستی خوا لابردنی ئەرکە، ئەنجامەکەی بەهەشتی پاڵدانەوەو خۆشییە، هەوڵ بدە لە قوتابخانەی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا لە ریزی پێشەوە بیت و پلەی یەکەم بەدەست بهێنی. ریزی یەکەم ریزی بلیمەتان و هەوڵدەرانە، ریزی کۆتایی ریزی تەمەڵان و ترسنۆکانە،

بە غەیری ڕیزی یەکەم ڕازی مەبە.

ئەی کۆتایی پێ هاتوو! ئەی کۆچەر! ئەی ڕۆیشتوو! خۆت ئامادە بکە بۆ گەشتە دوورو درێژەکەت، خۆزگە مردن خاڵی کۆتایی بوایە، دڵنیابە نەماندەهێشت پێش ئێمە باوەش بە دونیادا بکەی!! بەڵام مردن خاڵی گواستنەوەیە لە ژیانێك بۆ ژیانێکی تر، لە ژیانی کارکردن بۆ ژیانی سزادان، یان پاداشت دانەوە، لە ژیانێکی بەرتەسکەوە بۆ ژیانێکی فراوانتر، لە ژیانێکی نادادپەروەری و ستەمکاری بۆ ژیانی دادپەروەری و دوور لە ستەمکاری. دەمێکە دونیا ڕووت تێدەکا، بەدەورو پشتت دا دەسووڕێتەوە، بەڵام ئەمڕۆ دەستت لێ هەڵدەگرێ و دەستت بەردەداو ڕووبەڕووی چارەنووسی داهاتووت دەکاتەوە. پاڵپشتی تۆ ئەمڕۆ کێیە؟ براو خوشك وباوك و دایك و دۆستەکانت بە گیروگرفتی خۆیانەوە سەرقاڵ بوون، گەر سەیری دەورووبەرت بکەی، غەیری خوا و کارەکانی خۆت هیچی تر نابینیت.

ئەی ئەو کەسەی بە دوای نزیکترین ڕێگا بۆ بەهەشت دەگەڕێ! دڵت خاوێن کە لە کینە و حەسوودی و شوێنکەوتنی تایبەتمەندیەکانی خەڵکی. واز هێنان لەو شتانەی کە پەیوەندیان پێت نەبێ جوانی ملکەچکردنت بۆ خوا دەگەیێنێن و بە نزیکترین ڕێ دەتگەیێنێتە بەهەشتی خوا و لە دونیاش ئارامی بە دڵ و دەروونت دەبەخشێ.

ئەی ئەو کەسەی بەڕواڵەت وناونیشان ناوی خواناسی لەخۆت ناوەو ناوەڕۆکت بەتاڵە لەهەست کردن بە بوونی خوا! پڕە لە چاوبڕین لە ڕەزامەندی خەڵکی، گوێنەدەر بە ڕەزامەندی پەروەردگار ، لە ریزی پێشەوەی نوێژکەران دەوەستی کەچی ریزی پێشەوەی ئازاردان بە خەڵکیش لەدەست نادەی! لە دەرخستنی کەم و کورتی وعەیبی خەڵکی لە ریزی پێشەوەی و خەریکی پلاندانانی ملشکاندنی خەڵکی دەوروبەرتی لە پێناو بەرژەوەندیت، هەندێ جاریش دوژمنایەتی بۆ خەڵك تەنیا رەنگدانەوەی دڵە رەشەکەتە یان بۆ رەزامەندی گەورەکانتە، واتە بەهەشت دەفرۆشی بەدونیای خەڵك! یەکێ لەم دوو هەنگاوانەت لەبەردەمە: یان خۆت بەخواناس پیشان مەدە خەڵکی با نەبیت بەبەڵگەیەکی خراپ لەسەر رێی خواناسی، چونکە ئەوە گوناهەکانت زیاتر دەکات، یان دڵت خاوێنکە لەغەیری رەزامەندی خوا؛ رەنگدانەوەکەشی رزگاربوونی مرۆڤایەتی لە زەرەرو زیانی زمان ودەستت.

بەڕۆژ بەو شێوەیە لەگەڵ خەڵکدا خەریك دەبم، هەتا شەو دێت ئینجا دەچمە بەردەم بارەگای خوا دەپاڕێمەوە کە ئەو ئەرکەی پێی سپاردووم بە جوانترین شێوە جێبەجێی بکەم. ژیانم بووە بە ژیانی پاشاکان، ئەوان بە رۆژ لەگەڵ میللەت و بەشەو لەگەڵ نزیکانی کۆشکی پاشایین، بەڵام من بەشەو لەگەڵ خاوەنی زەوی و ئاسمان و

خوای هەموو پاشاکان کۆدەبمەوە، ئازاری تێکەڵبوونم بەخەڵك لە ڕۆژدا لەبیر دەچێتەوە، زۆر جار لە ڕۆژدا دڵم ئارەزووی فڕینی هەبووە بەرەو بارەگای خوا، تا خەڵك بەجێ بهێڵێت، بەڵام مەقەستی قەدەری خوا هەردوو باڵەکانمی بڕیوە، بۆ ئەوەی لەناو خەڵکدا بژیم و ڕێنماییان بکەم و بەرەو ئاسۆی ناسینی خوای خۆیاندا بیانبەم. بەڕاستی منیش لەو کاتەوەی هاتوومەتە ئەم ئاسۆ بەرزەوە، دڵم نایەت نانی شادبوون بە نزیکبوونەوە لە خوای گەورە بە تەنیا بخۆم، بەرچاوتەنگی سیفەتی خواناسان نییە، بۆیە بانگی هەموو دۆستان و خاوەن بیر وهۆشەکان دەکەم، هاوار دەکەم بەوپەڕی دەنگی خۆم، دوا پەیامیان پێ دەگەیێنم:

ئەی خەڵکینە ...!

ئەی ئەوانەی سەرقاڵی پارە پەیداکردنن... دەوڵەمەندی لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی نایانەوێت زەرەر بکەن ... قازانج لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی بەتوندی باوەشیان بە دونیادا کردووە....! ژیانی ڕاستەقینە لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی بەدوای دونیای کۆتایی پێ هاتوو هەناسەسوار بوون ...! بەهەشت لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی دەترسن خۆشیی دونیا کوتایی بێت...! خۆشی و لەزەتی بەردەوام لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی بەرەو ڕەزامەندیی خەڵکی دروستکراو هەنگاوی بێئومێدی دەنێن...! خوا لێرەدایە...!!

سوپاس بۆ خوای بەخشندەو میهرەبان کە منی گەیاندە ئەم پلەیە کە خۆشی تەواو لە دونیا وەربگرم، بێ ئەوەی ئاستی مرۆڤایەتیم دابەزێ، دڵ و دەروونیشی بە بەهەشت و نزیکی لە خۆی شادکردووم. کاری خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروون و بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و دارایی و رامیاری خەڵك، گەورەترین رۆڵێکە پێ هەڵدەستم لە پێناو گەیشتن بە گەورەترین ئاوات کە رەزامەندی خوایە.

دوای بەجێ هێنانی ئەو رۆڵەی بە من سپێردرابوو لەلایەن خوای گەورەوە، هەستێکی زۆر خۆشم تێدا پەیدابووە کە ئامادەم بێ هیچ جۆرە دڵگرانییەك دونیا بەجێ بهێڵم لەو ساتەی کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر وەرگرتووە لە قەدەری خۆیدا. من ئیستا هەرگیز لە مردن ناترسم، مردن بەلای منەوە چرکەیەك بێدەنگییە، چرکەیەك لە هۆش چوونە، مردن فەوتانێکی تەواوەتی نیە، بەڵکو تەنیا مردنی جەستەیە، بەڵام پێکهاتە سەرەکیەکەت کە گیانە، جارێ نامرێت، ئەگەر لایەنی زانستی وەربگرین، دەبینین بە درێژایی تەمەنت دەیان یاخود سەدان جار جەستەت بەتەواوەتی دەگۆڕێت بە مردنی خانەکانت وهاتنی خانەی تر لە شوێنیاندا، بەڵام ئەمرۆ دەبێ جەستەت بەتەواوەتی فڕێ بدەی، دەبێ ئەو گیانە رزگاری بێ لە

جەستەت بۆ ئەوەی راستیەکان ببینیّ، بەهەشت و دۆزەخ و فریشتە و جنۆکە ببینیّ، دەگوێزرێتەوە بۆ جیهانێکی فراوانتر (هەرچەندە لە قۆناغی کۆتایی، کە دەگەیتە دوا چارەنووست، یان بەهەشت یان دۆزەخ، بەرگی جەستەیی هەمیشەیی وەردەگری، کە شایەن بەو قۆناغەیە) . هەر چۆن لە سەرەتای لەدایکبوونت گوێزرایتەوە لە بۆشایی تاریکی تەسکی سکی دایکت بۆ فراوانی ژیانی سەر زەوی، وا ئێستاش دەچیتە جیهانێکی گەورەتر، کە بەچاوی جەستەی دونیات نابینرێت . دەرگای خۆشەویستان و یارانت لەبەرچاوی دەروونت بەفراوانی دەکرێتەوە. بەیەك گەیشتن بە فریشتەی مردن دیدارێکی ترسناکە بۆ ئەوانەی بیّ ئاواتی بەرز لە دونیادا دەژیان، ئەوانەی پڕبوون لە ئاواتی بچووك لە دونیادا، بەتاڵ بوون لە ئاواتی گەیشتن بە ئەنجامە گەورەکانی رێی خواناسین، بۆیە دڵتەنگ دەبن لە گواستنەوە لە پڕی بۆ بەتاڵی، لە دەوڵەمەندی بۆ هەژاری، لە قەرەباڵغی بۆ تەنیایی. بەڵام من بە ئاواتێکی زۆر گەورە دەژیام، بۆ ئاواتی پاش مردن هەوڵم دەدا، بۆ رەزامەندی خوای فریشتەی مردن کارم دەکرد، لەبەر ئەوە من بیّ گومان بەو دیدارە دڵگران نیم، دڵنیام بە توندی لەگەڵمدا ناجووڵێتەوە. ئەو برادەری منە، خواناسە، دڵنیام پێش ئەوەی بێت بۆ لام خوای گەورە رایسپاردووە ئاگای لێم بیّ، بەوپەڕی نەرم و نیانییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکات و جەستەم لیّ وەربگریّ. چۆن بیّ تاقەت دەبم، گەر بزانم وافریشتەکان و گیانی

پاکی هەموو خۆشەویستانی خوا پێشوازیم لێدەکەن، ئاهەنگێکی هەناسە برِم لەبەردەمە، مردن تێکدانێکی کاتییە و بنیاتنانی هەمیشەیی بە دواوەیە، سەربەرزی بۆ ئەوانەیە کە ریزیان لێ دەگیرێ و سەر شۆڕی بۆ لاساران و یاخیبوان لە رێگەی رەزامەندی خوایە. لە لوتکەی رەزامەندی خوای هەموو جیهانەکان فرِێدەدرێن بۆ ناو بناری تووڕەیی خوا، گەورەترین دەستکەوتی ئەم رێگای خواناسینە ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە مردن ناترسم، خۆشترین لەزەت گەیشتن بە ئاواتەکانە، بەتایبەتی ئەگەر ئاواتەکانت بەرزترین ئاوات بن. دڵخۆشترین قوتابیان لە رۆژی دەرچوونی ئەنجامەکان قوتابییە یەکەمەکانن، منیش لە قوتابخانەی خواناسیندا هەمیشە هەوڵی پلەی یەکەمیم داوە.

خوایە بە میهرەبانی خۆت پلەی یەکەمیم پێ ببەخشە، لەگەڵ خۆشەویستە یەکەمەکانی خۆت کۆمبکەرەوە، دڵم شادکەوە بە رەزامەندیت و دەستکەوتنی پەنای لێبوردنت، دوورم خەوە لە دۆزەخ و تووڕەیت و تەنانەت گلەییت، گوناهەکانم و هەڵەکانم لە بیر و زهن و مێشکی خەڵك و دەست و قاچ و زمان و پێستم ببەوە، تا لەسەر تاوانەکانم نەبن بە شایەت، تەنیا لە رۆژی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تۆدا دەترسم، تازانم دوا بڕیارت سەبارەت بە من چی دەبێ. من دڵنیام لە دادپەروەریت بەڵام ترسم لە هەڵەکانمە، تکات لێ دەکەم ، ئەی خوایە، هەڵەکانم نوقم کەی لە دەریای لێبوردنت.

قەڵەمی میهرەبانیت لاپەڕەکانی گوناهەکانم ڕەش کاتەوە. هەڵەکانم بپێوە بە لێبوردنت و هەژاریم بـە دەوڵەمەنـدیت و سەرشـۆڕیم بـە باڵادەستیت و با دوا بڕیارت سەبارەت بەمن شیاو بێ بە تـۆ نـەک شیاو بێ بە من!!

ئەی گەورەی گەورەکان! خوای هەموو جیهانەکان! بۆن خۆشمان کە بە ملکەچی بـۆت، لـە خـواردنی نزیکـی لێـت تێرمـان کـە، یارمەتیمان بدە و سەرمان بخە لەسەر خاڵەکانی لاوازیمان، پتەومان کە بە پشت بەستن بەهێزت و لێبوردنت و بـەزەییت. نهێنیـەکانمان خاوێن کە، پێداویستیەکانمان جێ بەجێ کە، کـارە ناشـیرینەکانمان داپۆشە، دەروونمان دەوڵەمەندکە، با دەستمان پـان نەکەینـەوە بـۆ غەیری تۆ، بمانپارێزە لە خۆمان و لە خەڵك، خەم و ئاواتەکانمان بکە بە یەك خەم و ئاوات، ئەویش نزیکبوونەوە لە ڕەزامەندیت و چوونە پەنای قەڵای بەندایەتی بۆ گەورەییت .

دڵ و دەروون و زمانم شایەتن لەسەر ئەوەی کە کـەس لـە تـۆ گەورەتر نیە، بێجگە لە تۆ هیچ خوایەکی تر لە ئارادا نیە، محمد ﷺ بەنـدە و دوا پێغەمبـەری تۆیـە، مـردن و زیندوبوونـەوە ڕەوایـە، بەهەشت و دۆزەخ ڕەوایە، ڕۆژی لێکۆڵینەوەی گشتی وا لە ڕێ دایە بۆ سزادانەوەی یاخیبوان ودانەوەی ماف بۆ خاوەن مافـەکان، ئـەی خوایە! ئەو ڕۆژەمان لێ بکەی بە شایی وخۆشی و بەختەوەری.

ئەی ئەو خوایەی چاوی دڵم غەیری ئـەو کـەس نابینێـت، دوا

داواکاریم ئەوەیە بە قەڵەمی ڕەزامەندییت لەسەر بەرگی لاپەڕەکانی ژیانم بنووسی: ئەوە ژیاننامەی یەکێکە لە خۆشەویستانی خوای زەوی و ئاسمانەکان.

# گەشتی دڵی

# خواناسێك

ئەی خەڵکینە ...!

ئەی ئەوانەی سەرقاڵی پارە پەیداکردنن...
دەوڵەمەندی لێرەدایە..!

ئەی ئەوانەی نایانەوێت زەرەر بکەن. ....
قازانج لێرەدایە...!

ئەی ئەوانەی بەتوندی باوەشیان بە دنیادا
کردووە. ....! ژیانی ڕاستەقینە لێرەدایە..!

ئەی ئەوانەی بەدوای دنیای کۆتابی پێهاتوو
هەناسەسوار بوون ... ! بەهەشت لێرەدایە..!

ئەی ئەوانەی دەترسن خۆشیی دنیا کوتایی
بێت. .. ! خۆشی و لەزەتی بەردەوام لێرەدایە..!

ئەی ئەوانەی بەرەو ڕەزامەندیی خەڵکی دروستکراو
هەنگاوی بێئومێدی دەنێن..... !

خوا لێرەدایە!!


**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

trizone ARCHITECTURE COVER.DESIGN